گۆڤاری زانکۆ بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان
ISSN (Print):2218-0222
ISSN (Online): 2412-396X

Vol.28 Issue 5 2024
ID No. 2172(PP 134-150)
https://doi.org/10.21271/zjhs.28.5.9

توێژینەوە

# ڕەنگدانەوەی دۆزی کورد لە ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی ئەمریکی لە ماوەی نیوان (١٩٦١-١٩٦٨)

**قارەمان حیدر رحمان/** بەشی مێژوو، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر،هەولێر ،هەرێمی کوردستان،عێراق

**اسماعیل عبدالله اسماعیل/** بەشی مێژوو، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر،هەولێر ،هەرێمی کوردستان،عێراق

## پوختە

نیویۆرک تایمز، ڕۆژنامەیەکی ئەمریکییە و بارەگای لە شاری نیویۆرکە. ڕۆژنامەکە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی، کاریگەریی زۆری بەسەر خوێنەرانی هەیە. یەکەم ژمارەی لە(١٨ی ئەیلولی ١٨٥١) بەناوی (The New York Daily Times) چاپکراوە. بەدرێژایی تەمەنی خۆی، یەکێک بووە لە دامەزراوە ڕۆژنامەوانییە متمانەپێکراوەکان، بەو هۆیەوە بۆتە خاوەنی دەیان خەڵاتی جیهانی و هەمیشە لە پرفرۆشترین ڕۆژنامە جیهانییەکان بووە. لە چوارچێوەی ئەم بابەتانەی ڕۆژنامەکە بایەخی پێداوە و لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦١-١٩٦٨) و ڕووبەرێکی فراوانی بۆ تەرخانکردوە، دۆزی کورد بووە لە عێراق. لەسەر ئەم بنەمایە ئەم توێژینەوە زانستییەمان بەناوونیشانی (ڕەنگدانەوەی دۆزی کورد لە ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمزی ئەمریکی ١٩٦١-١٩٦٨) ئەنجام دا. کە لە پێشەکی و سێ تەوەر پێکهاتووە. هەر تەوەرێکیش چەند باسێکی لەخۆگرتووە. لە تەوەری یەکەم کە بەناوونیشانی(سەرەتای ناساندی کورد) هاتووە. بە پوختی تیشکمان خستۆتە سەر بەشێک لەم بابەتانەی باسیان لە نەتەوەی کورد کردووە لە دوای دامەزراندن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکە. لە تەوەری دووەم تیشکمان خستۆتەسەر باسکردنی (ڕووداوەکانی شۆڕش و داخوازییە نەتەوەییەکانی کورد). لە تەوەری سێیەم و کۆتاییش کە بەناوونیشانی(ڕۆڵی ڕۆژنامەکە لە نیشاندانی هەڵوێستی سیاسی نێودەوڵەتی بەرامبەر دۆزی کورد) هاتووە. تیشک خراوەتەسەر هەڵوێستی نێودەوڵەتی و هەڵوێستی ڕۆژنامەکە بەرامبەر دۆزی کورد. دواجار لە کۆی ئەم توێژینەوەیەدا گەیشتینە ئەو ئەنجامەی، ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمزی ئەمریکی لەچوارچێوەی کاری پیشەییانەی خۆیدا، خزمەتی بەبایەخی بە دۆزی کورد لە عێراق گەیاندووە.

CORRESPONDENCE
قارەمان حیدر رحمان
Qaraman.rahman@su.edu.krd

| | |
|---|---|
| وەرگرتن | 2024/05/03 |
| پەسندکردن | 2024/07/02 |
| بڵاوکردنەوە | 2024/10/15 |

**وشە سەرەکییەکان:**
کورد،
دۆز،
ڕۆژنامە،
شۆڕش،
نیویۆرک.

**About the Journal**
ZANCO Journal of Humanity Sciences (ZJHS) is an international, multi-disciplinary, peer-reviewed, double-blind and open-access journal that enhances research in all fields of basic and applied sciences through the publication of high-quality articles that describe significant and novel works; and advance knowledge in a diversity of scientific fields.
https://zancojournal.su.edu.krd/index.php/JAHS/about

**پێشەکی :**

رۆژنامەی نیویۆرک تایمزی ئەمریکی، بەدرێژایی تەمەنی خۆی، لە دامەزراوە رۆژنامەوانییە متمانەپێکراوەکان بووە، بەو هۆیەوە بۆتە خاوەنی دەیان خەڵاتی جیهانی و هەمیشە لە پڕفرۆشترین ڕۆژنامە جیهانییەکان بووە. تەنانەت کاریگەری گەورەی لەسەر ئاڕاستەکردنی ڕای گشتی هەبووە، لەئەنجامی بایەخدانی بە بابەت و پرسە گرنگ و هەستیارە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییە هاوسەردەمەکانی خۆی.

لە چوارچێوەی ئەم بابەتانەی ڕۆژنامەکە بایەخی پێداوە و پانتاییەکی فراوانی بۆ باسکردنی تەرخانکردوە، دۆزی کورد و پاشخانی مێژوویی ئەم پێکهاتە نەتەوەییە بووە. دیارە ووردبوونەوەی ڕۆژنامەنووسانی بەدیمەنی ڕۆژنامەکە لە نمونەی دانا ئادامز شمیدت(Dana Adams Schmidt) و توماس ف برادی(THOMAS F. BRADY) و ئیرک پیس( Eric Pace) و سیمور توپینج( Seymour Topping) و ئەوانی دیکە لەم بابەتە، بەهۆی ناوبانگ و ئەزمونی زۆریان لە بواری ڕۆژنامەگەری، زیادەیەکی دیکە بوو، ڕۆژنامەکە بە دۆزی کوردی بەخشی، ئەمەش بەڕادەی خۆی، هاریکار بوو بۆ بەنێودەوڵەتیکردنی پرسەکە و گواستنەوەی لە چوارچێوەیەکی نێوخۆیی بۆ چوارچێوەیەکی فراوانتری جیهانی. لەسەر ئەم بنەمایە ئەم توێژینەوە زانستییەمان بەناوونیشانی (ڕەنگدانەوەی دۆزی کورد لە ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمزی ئەمریکی ١٩٦١-١٩٦٨) ئەنجام دا.

هۆکاری هەڵبژاردنی بابەتەکە: دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی کەلێن و بۆشاییەکی زۆری زانستی، لەسەر تێگەیشتن لە ڕۆڵ و هەڵوێستی ڕۆژنامەگەری جیهانی، لە ناساندن و پشتیوانیکردنی دۆزی کورد لە عێراق و هاوکات هەڵگیرسانی خەباتی چەکداری کورد لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦١-١٩٦٨) و ڕەنگدانەوەی هەواڵەکانی لەم ڕۆژنامەیە، هۆکارێکی دیکەی هەڵبژاردنی بابەتەکەیە.

گرنگی توێژینەوە: خۆی دەدۆزێتەوە لە خستنەڕووی هەڵوێستی مێژوویی ڕۆژنامەیەکی بەناوبانگی ئەمریکی، لە پشتیوانیکردنی دۆزی گەلێکی دابڕاو لە هۆکارەکانی پەیوەندیکردن بە پێگە سیاسی و خاوەن بڕیارەکان. سەرباری ڕۆڵی پربایەخی ڕۆژنامەکە لە ئاشناکردنی ڕای گشتی بە دۆزی کورد.

میتۆدی توێژینەوە: لەم توێژینەوەیەدا بە پیادەکردنی شێوازی وەسفی و شیکاری، کارمان کردوە بۆ خستنەڕووی بەشی زۆری ڕووداوەکانی ئەم ماوە مێژووییە، دوای ئەوەی پرسەکە لە دیدی نێوەندە جیهانییە کاریگەرەکانی جیهان، چووە نێو خانەی هاوکێشە سیاسییە هەرێمایەتی و نێودەوڵەتییەکان.

سنووری توێژینەوە: لە ڕووی مێژووییەوە، لەگەڵ سەرهەڵدانی بزاڤی کورد لە ئەیلولی ١٩٦١ دەست پێدەکات، تا هاتنە سەر دەسەڵاتی بەعسییەکان لە بەغدا لە ٣٠ی تەمموزی ١٩٦٨. لە ڕووی جوگرافیشەوە، تیشکی خستۆتە سەر ئەم ڕووداوانەی لە باشووری کوردستان و بەغدای پایتەختی عێراق و بەشێک لە وڵاتەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا و ئەمریکا ڕوویانداوە.

پێکهاتەی توێژینەوە: بریتییە لە سێ تەوەر، هەر یەکێک لەم تەوەرانەش دابەشی سەر چەند باسێک کراون. لە تەوەری یەکەم کە بەناوونیشانی(سەرەتای ناساندی کورد) هاتووە. بە پوختی تیشک خراوەتەسەر سەر بەشێک لەم بابەتانەی باسیان لە نەتەوەی کورد کردووە لە دوای دامەزراندن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکە و دابەشی سەر دوو باس کردوە، لەمانەش(ڕۆڵی ڕۆژنامەکە لە ناساندنی کورد). و (هەڵوێستی ڕۆژنامەکە لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی بەرامبەر بە کورد).

تەوەری دووەمی توێژینەوەکە کە بەناوونیشانی (خستنەڕووی ڕووداوەکانی شۆڕش و داخوازییە نەتەوەییەکانی کورد) هاتووە، دابەشی سەر سێ باسکراوە. تیایدا ئاماژە بە ڕۆڵی ڕۆژنامەکە لە دەرخستنی ڕووی ڕاستی ڕووداوەکانی شۆڕشی کورد کراوە، وەک سەرەتایەک بۆ ڕاستکردنەوەی زانیارییەکانی لە دامەزراوەکانی حکومەتی عێراق دەگەیشتنە نێوەندە ڕۆژنامەوانیە جیهانییەکان. سەرباری نیشاندانی بەشێک لە چاڵاکی شۆڕشگێرانی کورد و باسکردنی چاڵاکییە دیبلۆماسییەکانی کورد لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا و عەرەبی.

لەتەوەری سێیەمی توێژینەوەکە، کە بەناوونیشانی (ڕۆڵی ڕۆژنامەکە لە خستنەڕووی هەڵوێستی سیاسی نێودەوڵەتی بەرامبەر دۆزی کورد) هاتووە، هاوشێوەی تەوەری پێشوو، دابەشی سەر سێ باسکراوە. لەنێوەڕۆکی ئەم باسانەدا، تیشک خراوەتەسەر هەڵوێستی نێودەوڵەتی و هەڵوێستی ڕۆژنامەکە بەرامبەر دۆزی کورد، سەرباری باسکردنی ڕۆڵی ڕۆژنامەکە لە گواستنەوەی دەنگ و داخوازی کورد بۆ نێوەندە جیهانییەکان.

سەرچاوە سوودبەخشەکان: بۆ ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیە، زۆرترین سوودمان لە چەند ژمارەیەک لە دانە ڕەسەنەکانی ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز وەرگرتووە. سەرباری بەکارهێنان و سوودوەرگرتن لە یاداشت و بیرەوەری کەسایەتیەکی هاوسەردەمی ڕووداوەکانی ئەم سەردەمەی عێراق. وێڕای سوودوەرگرتن لە سەرچاوەی مێژوویی دیکە لە نمونەی کتێبی بەڵگەنامەیی و کتێبەکانی پەیوەندیدار بوون بەبابەتەکە. دواجار کۆی ئەنجامەکانی لەم توێژینەوە زانستییە پێیگەیشتین، لە چەند خاڵێک لە کۆتایی خستومانەتەڕوو، کە

بەگشتی هاریکار و یارمەتیدەردەبن بۆ توێژەرانی ئەم بابەتە و دەبنە بنەمایەکی زانستی بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی زیاتر، کە بێگومان ئەم بابەتە پێویستی بە کاری زیاتر هەیە، چاوەڕوانی ئەوە دەکەین، لە کاری زانستی دیکەدا دەوڵەمەندتربێ.

## 1-پوختەیەکی مێژوویی لەسەر ڕۆژنامەکە و ڕۆڵی لەناساندنی کورد

ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز، بەدرێژایی مێژووی دەرکەوتنی، ڕۆڵی دیاری لە خستنەڕووی بەشی زۆری ئەو بابەتانەدا هەبووە ، کە پەیوەندیان بە کورد هەیە، وەک لە خوارەوە باسی دەکەین:

### 1-1- پوختەیەکی مێژوویی لەسەر ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز:

نیویۆرک تایمز، ڕۆژنامەیەکی ئەمریکییە و بارەگای لە شاری نیویۆرکە. ڕۆژنامەکە کاریگەریی زۆری بەسەر خوێنەرانی هەیە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. یەکەم ژمارەی لە(١٨ی ئەیلولی ١٨٥١) بەناوی نیویۆرک دەیلی تایمز (The New York Daily Times) چاپکراوە و دواتر (١٣٢) جار خەڵاتی ( بولیتزر-Pulitzer)ی بەدەستهێناوە(١). خاوەنی ئەم ڕۆژنامەیە (کۆمپانیای نیویۆرک تایمزە). ئەمیش کۆمپانیایەکی هاوبەشیکارە و لەژێر سەرپەرشتی (سولزبرجSulzberger )(٢) دایە. ئەم خێزانە لە ساڵی (١٨٩٦)ەوە مولکداری ئەو ڕۆژنامەیەن. (.Dash, The New York Times, Jan. 19, 2009 )

نیویۆرک تایمز زۆربەی کات بە ڕۆژنامەیەکی سەرەکی نیشتمانی دادەنرێ، هەمیشە لە نێوەندە سیاسی و جەماوەرییەکاندا پشت بە هەواڵ و بابەتەکانی دەبەستریٚ و متمانە پێکراوە. دامەزرێنەرەکانی هنري جارفيس ريموند( Henry Jarvis Raymond)(٣) و جورج جونز( George Jones) بوون. لەیەکەم ژمارەی ئەم ڕۆژنامەیەدا نووسیویانە، ئەمڕۆ ژمارەی یەکەمی ڕۆژنامەی (نیویۆرک دەیلی تایمز) دەرچوو، هەوڵئەدەین، هەموو بەیانییەک تەنها ڕۆژی یەکشەممە نەبێ بڵاویبکەینەوە.( ,The New York Daily Times (September 18, 1851, p.2

### 1-2- ڕۆڵی ڕۆژنامەکە لە ناساندی کورد:

لەچوارچێوەی گواستنەوەی هەواڵێکی تایبەت بە دۆخی ئاڵۆزی لوبنان لە ساڵی ١٨٦٠، بەهۆی شەڕی دروزەکانی لوبنان و کریستیانەکانی سەر بەکلێسەی یۆنانی کاسۆلیکی ، ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز ناوی کوردی هێناوە. لەم باسەدا ڕۆژنامەکە تیشکی خستۆتە سەر بەشداری کوردەکانی دانیشتووی سوریا لەشەڕەکە. بەشێوەیەک ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە لەهێرشکردنە سەر ناوچەی کریستانەکان لەشاری (زحلة)(٤) کە دوا مۆڵگەی کریستانەکانی ناوچەکە بوو، دروزەکان بەهاوکاری کوردەکان، (١٠٠٠) کەسیان کوشتوە. هەروەها لە هێرشکردنە سەر ناوچەی(دير القمر)(٥) کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی کریستیان بوون، کوردەکان ڕۆڵیان هەبووە لە وێرانکردن و تاڵانکردنی هەموو ماڵەکانی ئەم ئاواییە(The New York Times, July 20, 1860, p.1).

بەگشتی ئەوەی تێبینی دەکرێ، لەدەستپێکی ئەو هەواڵانەی ڕۆژنامەکە لەسەر کورد بڵاویکردەوە، وێنایەکی ناشارستانی کوردەکانی وەک پێکهاتەیەکی توندوتیژ و پارێزگار نیشانداوە. ئەم ئاڕاستەیەی لەسەر کوردەکان گرتیەبەر، بەردەوام بوو، بەجۆرێک لە ڕووداوی دیکەی مێژووییدا، سەیر دەکەین، ڕۆژنامەکە بەهەمان شێوازی پێشوو، باسی کوردەکانی کردووە، ئەو کاتەی لایەنێکی ململانێیەکان بوون. لە نمونەی هەواڵی هەڵگیرسانی ڕاپەرینی کورد بە ڕێبەرایەتی (شێخ عوبێدولای نەهری) لە ساڵی (١٨٨٠). بۆیە ڕۆژنامەکە لە بابەتێکدا بەناونیشانی(کوردە هەڵگەراوەکان)، جارێکی دیکە کوردەکان بە پیادەکردنی کاری توندوتیژی و وێرانکاری تۆمەتبار کرد و لەم بارەیەوە نووسیویەتی:" جارێکی دیکە کوردەکان دەستیان بەکاری توندوتیژی کردەوە و ژمارەیەک گوندیان لە وڵاتی فارس وێرانکرد. تەنانەت چوونە ناو شاری (سەلماس) لە هەرێمی ئازەربێجان. بەو هۆیەوە بەشێک لە هێزەکانی ئێران کە (٢٥) هەزار سەربازبوون، بە (١٢) تۆپی دوورهاوێژەوە، لە تارانەوە ڕوویانکردە شارۆچکەی (قەزوین) بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کوردەکان.( .(The New York Times, October 24, 1880, p.2

ڕۆژنامەکە لەسەر ئەم ئاڕاستەیە بەردەوام بوو لە وێناکردنی کوردەکان وەک پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی ناشارستانی و تەنانەت لە درێژەی هەواڵەکانی لەسەر کورد بڵاویکردنەوە، لە ڕووداوی کۆمەڵکوژیکردنی ئەرمەنەکان لە ساڵی ١٨٩٥ بەدەستی هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی، کوردەکانی بە بکەر و ئەنجامدەری تاوانەکە ناساند، بێ ئەوەی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بکات بۆ ئەو زانیارییانەی دەگەیشتنە ڕۆژنامەکە وەک لە نێوەرۆکی بابەتێکیدا بەناوونیشانی(بەپێی زانیاری قەشە جۆرج فیلیانەوە، لە پرۆسەی کۆمەڵکوژیی ئەرمەنییەکان، کوردەکان کاری دڕندانەی ترسناکیان ئەنجام داوە و تەنانەت هێشتا پێشبینی دڕندەیی قێزەونتر هەیە) هات و تیایدا نووسی:" قەشە جۆرج فیلیان، ئەرمەنییەکی دەربەدەرە، پاشنیوەڕۆی دوێنێ لە وتارێکی لە بەرلین ، لەسەر کۆمەڵکوژی ئەم دواییەی ئەرمەنییەکان لەلایەن کوردەکانەوە پێشکەشی کرد. ڕایگەیاند، چیرۆکە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵکوژییەکە، زیادەڕەوی تێدا

نەکراوە، بەڵکو دڕندەییەکان لەوە خراپترن کە باسکراوە".( The New York Times, January 14, 1895, p.3). ئەم هەواڵانەی ڕۆژنامەکە لەسەر چالاکییە سەربازییەکانی ئەو هێزانە بڵاویکردنەوە، کە لەچوارچێوەی هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوون، هەرچەندە بەشێکیان بە ڕەگەز کورد بوون، بەڵام ئەمانە نوێنەرایەتی گەلی کوردیان بە شێوەیەکی گشتی نەکردووە. بەڵکو تەنها نوێنەری خۆیان و ئاغاکانیان بوون. بۆیە ڕۆژنامەکە لەم نێوەندەدا، کاری پیشەییانەی خۆی بەپێی پێویست ئەنجام نەداوە، بۆ دەرخستنی ڕووی ڕاستی ڕووداوەکان وەکو خۆیان و کاری نەکردوە بۆ ساخکردنەوەی زانیارییەکان.

## 1-3- هەڵوێستی ڕۆژنامەکە لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی بەرامبەر بە کورد

هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی(١٩١٤-١٩١٨)، وەک ڕووداوێکی سیاسی و سەربازی کاریگەر لەسەر ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هاوکات دۆخی کوردەکان لەم ناوچەیە و پابەندییان بە پرەنسیپە ئاینییەکان و خۆبەستانەوەیان بە بەرەی دەوڵەتی عوسمانی لەدژی هێزە هاوپەیمانەکان، ڕووبەرێکی فراوانتری لە چوارچێوەی هەواڵ و بابەتەکانی ڕۆژنامەکە دابڕی. لە کاتێکدا کوردەکان بێ ئاگابوون لەوەی ڕۆژنامەگەری جیهانی وەک چاودێری ڕووداوەکان، دەسەڵاتێکی کاریگەرە، لەسەر کاڵکردنەوەی داوا نەتەوەییەکانیان. چونکە ئەوان لە بنجدا دەوڵەتی عوسمانیان وەک هێزێکی نەیار و دژ بە ئازادی و سەربەخۆیی گەلانی چەوساوە دەبینی.  بەپێی ئاماژەکانی ڕۆژنامەکە، کوردەکان بە پێچەوانەی ئاراستە نەتەوەییەکانی خۆیان هەنگاویان هەڵێناوە، بۆ ڕزگارکردنی گەلەکەیان لەم دۆخەی بەدرێژایی سەدان ساڵ لەژێر دەستی وڵات و دەسەڵاتێکی بێگانە ڕووبەڕووی بوونەوە. ئەمەش لە پوختەی هەواڵی هێرشی سەربازی هێزەکانی بریتانیا بۆ سەر ناوچەکانی هەرێمی میسۆپۆتامیا(عێراق) لە ساڵی ١٩١٥ تێبینی کرا، کاتێک سەیرمان کرد، کوردەکان لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی شەڕی بریتانییەکانیان کرد(ظاهر،2010،ص28). ڕۆژنامەکە ئەم کردەی کوردەکان لە بابەتێکدا بەناوونیشانی (تورکیا و کورد هێرش دەکەنە سەر ئینگلیزەکان) بڵاوکردەوە و نووسیویەتی :"بەپێی ڕاپۆرتێکی فەرمی لە (١٤ی نیسانی١٩١٥) لەلایەن ئۆفیسی هیندستانەوە دەرچووە، لە (١٢ی ئاداری١٩١٥) نزیکەی(١٢) هەزار جەنگاوەری کورد و عەرەب، هێرشیان کردە سەر پێگەکانی بەریتانیا لە (قورنە) و (ئەهواز) لە هەرێمی مێسۆپۆتامیا. بەڵام دوورخرانەوە و ٣٠٠ دیل و دوو دەمانچەیان کەوتە دەستی ئینگلیزەکان. لەبەرامبەردا زیانە گیانیەکانی بەریتانیا، بەپێی ڕاپۆرتەکە، (٩٢) کەسی بریندار بوون".( The New York Times, April 15, 1915, p.2). بەم شێوەیە ڕۆژنامەکە جارێکی دیکە، کوردەکانی وەک هێزێکی کۆنەپەرستی پارێزگار وێناکرد و هەڵوێستی ئەم پێکهاتە سەربازییەی کوردی گشتگیرکرد، بەسەر هەموو گەلی کورد لە عێراق و ناوچەکانی دیکەی کوردستان.

دیارە بەشێک لە نیشتمانپەروەرانی کوردی پێگەیشتوو بە بیری نەتەوەیی، بۆ خۆرزگارکردن لەم دیدگا جێگیرەی وڵاتە ڕۆژئاواییەکانی زلهێزی ئەو سەردەمەبوون بەرامبەر بە گەل و داخوازییە نەتەوەییەکانیان، ڕووبەڕووی ئەم هەڵوێستەی بەشێک لە سەردارانی کورد بوونەوە، کە بەهۆی بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی، داواکاریە نەتەوەییەکانی گەلەکەیان کاڵ کردبوییەوە. ئەمەش لەدوای بەشدارییکردنی شێخ عەبدولقادری نەهری لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس ساڵی ١٩١٩ بۆ دابەشکردنی موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە تێبینی کرا. دوای ئەوەی ئەو شاندەی بە نوێنەرایەتی نەتەوەی کورد بەشداری کۆنگرەی کرد6، پێچەوانەی خواست و ویستەکانی دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمانی، گەیشتنە ڕێککەوتن و لێکتێگەیشتن لەگەڵ سەرۆک و سەردارانی ئەرمەنی، بۆ چارەسەرکردنی پرس و کێشەکانی نێوان هەردوو نەتەوە. کە بەهۆی ململانێی دەولەتی عوسمانی لەگەڵ ئەم پێکهاتە نەتەوەییە، ڕووبەڕووی بوونەوە. ئەم باسەش لە ڕێگەی ڕاپۆرتێکی  پەیامنێری ڕۆژنامەکە، کە لە (٨ی ئاداری١٩٢٠) لە قوستەنتینییەوە ئاڕاستەی ڕۆژنامەکەی کرد بەناوونیشانی (کورد ئاشتی لەگەڵ ئەرمەنەکان دەکات؛ تورکەکان دڵتەنگن بە داواکاریی کوردستان بۆ ئۆتۆنۆمی) بە پوختی باسی لێکرا. لەم هەواڵەدا پەیامنێرەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە:" ڕۆژنامەگەری تورکیا زۆر شڵەژاوە بە لێکتێگەیشتنی نێوان ئەرمەنەکان و کوردەکان و هەوڵی سەرکردە کوردەکان لە پاریس بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد. وەک لە ڕۆژنامەکەدا هاتووە، عەبدولقادر ئەفەندی7، بە نوێنەرایەتی کوردستان لە ئەنجومەنی پیران، ڕاپۆرتی ڕێککەوتنی نێوان ئەرمەنەکان و کوردەکانی بۆ وەستاندنی شەڕ، بۆ ڕۆژنامەنووسان پشتڕاستکردەوە. هەروەها بە توندی بەرگری لە داخوازی کورد بۆ ئۆتۆنۆمی کرد. لە ئەنجامدا دیدارەکەی عەبدولقادر نەهری لەگەڵ ڕۆژنامەنووسان، بووە مایەی نیگەرانی و تورەیی ڕۆژنامەگەری وڵاتانی ئیسلامی، پەیامەکەی نەهریان بە گوماناوی وەسف کرد، کە ئامانج و  ئارەزووی جیابوونەوەیان لە خەلافەت تێدا بەدی کرد. بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکە، شێخ عەبدولقادر نەهری ئاماژە بۆ ئەوە کرد، زۆرینەی سەرکردەکانی کوردستان پشتیوانی دەکەن، بەڵام لە هەمان کات نایانەوێ دەستبەرداری پەیوەندی ئاینییەکانیان بن لەگەڵ قوستەنتینیە، بەڵکو بەهۆی ئەو ئیدارە خراپەی هەیە، دەیانەوێ سەربەخۆیی سیاسییان هەبێت".( The New York Times, March 9, 1920, p.2). بەم شێوەیە دەکرێ بڵێن، لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی و بەهۆی سیاسەتی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئیستعماری بۆ لێکترازاندنی  ڕیز و

هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی، لە پێناو لاوازکردنی ئەم قەوارە سیاسییە لەناوچەکە، ئاڕاستەیەکی پێچەوانەی لەگەڵ سەردەم و قۆناغەکانی پێشووتر وەرگرت و وردتریش لەمە دەتوانین بڵێن، ئاڕاستەی نوێی ڕۆژنامەکە، پشتگیرکردن و زەقکردنەوەی مافە نەتەوەییەکانی کورد بوو، لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵانەی پەیوندییان بەو پرسەوە هەبوو. دواجار ئەم بابەتانەی لەپێشەوە باسکران، سەرباری دەیان بابەت و هەواڵی دیکەی ڕۆژنامەوانی، کە لەلایەن پەیامنێرانی ڕۆژنامەکە لەسەر بارودۆخی سیاسی لە بەشە جیاوازەکانی کوردستان ئامادەکران، بەڕادەیەکی زۆر، ڕۆڵیان بینی لە ئاشناکردنی خوێنەرانی ڕۆژنامەکە، بە دۆزی کورد و خەباتی لەپێناو ئازادی و سەربەخۆییدا، بەتایبەتی دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد لە باشووری کوردستان لە ئەیلولی ١٩٦١. کە پوختەکەی لەخوارەوە دەخەینەڕوو.

## 2- خستنەڕووی ڕووداوەکانی شۆڕش و داخوازیيە نەتەوەییەکانی:

داخوازییە نەتەوەییەکانی کورد لەم قۆناغە مێژووییەدا، خواستی پاراستنی زمان و کولتوور و مێژوو، بەدیهێنانی جوگرافیا و ئابوورییەکی هاوبەش بوو، لە چوارچێوەی قەوارەیەکدا، کە بەڕێوەبەرایەتییەکەی لەدەستی هاوزمان و رەگەزێک بێ لە دانیشتوانی ناوچە کوردییەکان و دەسەڵاتێکی بیانی حومکران و سەردارنەبێ بەسەر بەرژەوەندییەکانیان. ئەم داخوازییانە کاتێک لەلایەن دەسەڵاتدارانی عێراق لەهەردوو سەردەمی پادشایەتی و دواتر لەدوای شۆڕشی ١٤ تەمموزی ١٩٥٨ لەسەردەمی کۆماری فەرامۆشکران و بەنادیدەگیران(بڕوانە: ملا، 2008، ص110). بەگشتی بوونە هۆکاری هەڵگیرسانی شۆڕشێکی سەرتاسەری، کە بەشێکی زۆری ڕووبەری ناوچەکانی باشووری کوردستانی گرتەوە. ئەم ڕووداوە سیاسی و سەربازییە، بەهۆی گرنگی و بایەخی پێگەی جیۆسیاسی عێراق لەناوچەکە، کەوتە چوارچێوەی هەواڵە گەرمەکانی ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لەم ماوە مێژووییەدا. بەتایبەتی لە دوو ساڵی کۆتایی حوکمرانی عەبدولکەریم قاسم لە عێراقدا. وەک لە خوارەوە باسی دەکەین:

### 2-1- خستنەڕووی ئاڕاستەی ڕووداوەکانی بزاڤی کورد

ڕۆژنامەکە سەرەتای هەواڵەکانی خۆی لەدوای هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد، بە هەواڵی دەستگیرکردنی ڕێبەری کورد، مەلا مستەفا بارزانی دەستپێکرد، کاتێک بەسوود وەرگرتن لە ئاژانسەکانی هەواڵی عێراق، بڵاویکردەوە بارزانی لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئێران دەستگیرکراوە، بە تۆمەتی پیشەوایەتیکردنی هەڵگەڕانەوەیەک لەدژی دەسەڵاتدارانی بەغدا و لە ماوەی کورتی داهاتوو، رادەستی حکومەتی عێراق دەکرێ.(The New York Times, Sept. 27, 1961, P. 5)

هەواڵەکە لەبەدەستهێنانی زانیارییەکەی، سوودی لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی حکومەتی عێراق وەرگرت، کە لە بنجدا ئامانجی چەواشەکردنی ڕای گشتی بوو. لەپێناو نیشاندانی توانا و هێزی دەسەڵات لە بەغدا، لە شکستپێهێنانی شۆڕشی کورد. بەڵام ئەو ڕاستییەی هەبوو، جیاواز بوو، بەجۆرێک ڕۆژنامەکە هەر دوای ماوەیەکی کورت لە هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد، بەدوای بڵاوکردنەوەی وردەکاری دەرهاوێشتەکانی ئەم شۆڕشە و شێوازی ڕووبەڕووبوونەوەی لەلایەن حکومەتی عێراق. بابەتێکی دیکەی بەناوونیشانی (وێرانکردنی ١٠٠ گوند لە شۆڕشی کوردەکان لەدژی قاسم) بڵاوکردەوە و تیایدا هات:" هۆزە کوردییەکان هەڵگەڕانەوەیەکی فراوانیان لەدژی هیزە چەکدارەکانی سەرۆک وەزیران عەبدولکەریم قاسم(١٩٥٨-١٩٦٣) دەستپیکردووە لە ناوچە شاخاوییەکانی باکووری عێراق.(The New York Times, April 24, 1962, p. 1,16 ). ئەمەش دەرخەری ئەو ڕاستییەیە، حکومەتی عێراق، بەهۆی کاریگەریی شۆڕشەکە، گەیشتە ئەو رادەی وشک و تەر بەیەکەوە بسوتێنی و دەست لە خەڵکی سڤیلی کوردیش نەپارێزێ بۆ لەناوبردنی شۆڕشەکە. بەم جۆرەش ڕۆژنامەکە، ڕادەی بەکارهێنانی توندوتیژی حکومەتی عێراقی نیشانی ڕای گشتیدا، لەپێناو سەلماندنی ئەو ڕاستییەی لەگەڵ بەرژەوەندی سیاسی وڵاتانی ڕۆژئاوا کۆک بوو، دوای دوورکەوتنەوەی رژێمی نوێی عێراق لەبەرەی ڕۆژئاوا و وابەستەبوونی بە بیری ناسیۆنالیستی توندڕەوی عەرەبی، کە دژ و ناکۆک بوو لەگەڵ بنەما دیموکراسییەکانی ئەو سەردەمە(بڕوانە: علو،2007،ص103).

لەم سۆنگەوە دەکرێ بڵێین، پێشهاتە سەربازییەکانی شۆڕشی کورد، لەئەنجامی ئەو تێڕوانینەی وڵاتانی زلهێزی ڕۆژئاوا بەرامبەر بە عێراقی نوێ هەیانبوو، بوونە مایەی بایەخپێدانی لەلایەن ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز، تەنانەت زۆرکات پەیامنێرانی ڕۆژنامەکە لە بەیروتی پایتەختی لوبنان و تاران و بەغدا، ڕۆژانە بەدوای بەدەستهێنانی زانیاری تازەبوون لەسەر ئەم پێشهاتانەی لە باکووری عێراق وەک ڕۆژنامەکە ئاماژەی پێکردووە ڕوویانداوە. زۆرکات ئەم ڕۆژنامەیە چۆتە سەر بڵاوکردنەوەی هەواڵە لاوەکییەکانیش، بەجۆرێک پەیامنێرەکانی پڕژاونەتە سەر بەخشینی زانیاری لەسەر ووردەکاری پرۆسە سەربازییەکانی سوپای عێراق لە دژی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، وەک ئەو هەواڵەیان کە باس لە گەمارۆدانی حەشارگەیەکی چەکی شۆڕشگێرە کوردەکان دەکات. لەم هەواڵەدا ڕۆژنامەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە لە(١٠ی ئایاری١٩٦٢) هێزەکانی پۆلیس و هێزە کوردییە غەیرە نیزامییەکانی سەر بە حکومەتی

عێراق، ناوچەیەکیان لە باکووری عێراق گەمارۆداوە، کە حەشارگەیەکی نهێنی مەلا مستەفا بارزانی ڕێبەری شۆڕشی کوردی تێدایە.(The New York Times, May 11, 1962, p.3)

دیارە بڵاوکردنەوەی هەواڵی ڕۆژانەی شۆڕشی کورد و بایەخپێدانی لە نێوەندە سیاسییەکان، بەهۆی کاریگەرییەکانی لەسەر بارودۆخی ناوچەکە، کە بەشێکی زۆری بەرژەوەندییەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا و ئەمریکای پێیەوە بەسترابویەوە، هۆکاری ڕاستەوخۆ بوو بۆ گرنگیدانی زیاتری ڕۆژنامەکە بە ڕووداوەکانی شۆڕشی کورد. لەم سۆنگەوە گواستنەوەی وێنای راستەقینەی ڕووداوەکان، هەمیشە ڕووبەرێکی بەرفراوانی ڕۆژنامەکەی داگیر کردوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی یەکێک لە پەیامنێرەکانیان بەناوی (دانا ئادامز شمیدت)8 لە (٢٥ی ئابی ١٩٦٢) ڕەوانەی ئەو ناوچەیە کرد لە عێراق، کە لەژێر دەستی شۆڕشگێرانی کورد بوو. ئەم ڕۆژنامەنووسە لەم سەردانەی بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشگێرانی کورد ئەنجامیدا، دواتر لە چوار ژمارەی ڕۆژنامەکە، چوار ڕاپۆرتی دووروردرێژی لەسەر شۆڕشی کورد بڵاوکردەوە، کە لە دوو لەم ڕاپۆرتانەیدا، دیداری ڕاستەوخۆی لەگەڵ ڕێبەری کورد مەلا مستەفا بارزانی ئەنجام دابوو.(( Schmidt, The New York Times, September 11, 1962, P. 1,14.

شمیدت لە یەکێک لەم ڕاپۆرتانەیدا کە ڕاپۆرتی دووەمی بوو، لەڕۆژی (١١ی ئەیلولی١٩٦٢) بڵاوکرایەوە. بە ناوونیشانی:(سەرکردەی شۆڕشگێرانی کورد دەڵێت: هێز تاکە ڕێگایە بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی). نووسیویەتی:" لە شوێنێک لە باکووری عێراق، لە (٢٥ی ئاب) گەیشتمە ئەو خاڵە، مەلا مستەفا بارزانی تێدابوو. بەهۆی ئەوەی بارزانی خەباتگێر چەند نوێنەرێکی خۆی لە مانگی (ئایار) ڕەوانەی بەیروت کرد، لەبەرئەوەی پێی وایە پەیوەندیکردن لەگەڵ جیهان لە ڕێگەی ئەم ڕۆژنامەیە زۆر گرنگە بۆ شۆڕشی کورد و شۆڕشگێرەکانی خەبات دەکەن بۆ بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمی".( Schmidt, September 11, 1962.p 1,14)

بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکە، مەلا مستەفا بارزانی لەو دیدارەدا بە شمیدتی ڕاگەیاندووە:" ئەو زۆر قسەی هەیە بۆ گوتن لە بارەی دادپەروەری لە جیهان، بەڵام دادپەروەری بۆ بەهێزەکانە، لەبەرئەوەی بەهێزەکان حوکمڕانی دەکەن". لە ڕوونکردنەوەی ئەو گوتەی بارزانیدا، پەیامنێرە ئەمریکییەکە نووسیویەتی:" بۆیە ئەو دەیەوێ بەهێزبێ و مەبەستیەتی کوردەکان بەهێزبن بە پێی پێویست، بۆ سەپاندنی ئیرادەیان بەسەر حکومەتی عێراق و هەروەها مەبەستیەتی کار بکات لەسەر ئەوەی جیهان بە تایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کاروبارەکانیان بگرێتەخۆ".(Schmidt, The New York Times, September 11, 1962, P1,14)

دیارە یەکێک لەو پرسانەی کاریگەریی نەرێنی لەسەر دۆزی کورد هەبوو لە ماوەی ڕێبەرایەتیکردنی مەلا مستەفا بارزانی، پرسی شیوعیەکان بوو لە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستان. ئەو بابەتە بە بڕوای مەلا مستەفا بارزانی، دەرهاوێشتەی نەرێنی بەسەر دۆزی کورد هەبوو. بەو هۆیەوە لەو دیمانەی لە ئەیلولی ١٩٦٢ لەگەڵ شمیدت ئەنجامیدا، بارزانی ئاماژەی بە دوورخستنەوەی بەشێک لەو سەرکردانەی ریزەکانی پارتی کرد، لەوانەی مەیلی شیوعیەتیان هەبوو، لە نمونەی هەمزە عەبدوڵڵا. تەنانەت بارزانی بە خیانەتکار وەسفی کرد. چونکە بە بڕوای ئەو بیری شیوعیەت، فەلسەفەیەکی گشتگیرە و لەگەڵ بیری نەتەوایەتی یەک ناگرێتەوە. بەتایبەتی لەو کاتەی شیوعییەکان لەسەر بنەمای فەلسەفەی ستالین، ئامادەنەبوون دانبنێن بە بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی.( لەبەرئەوەی پێیان وابوو، خاوەنی جوگرافیا و ئابوورییەکی هاوبەش نیە.(Schmidt, September 11, 1962.p 1,14

## 2-2- ڕەنگدانەوەی کردە سەربازی و سیاسییەکانی کورد بەرامبەر حکومەتی عێراق

ئەو بابەتانەی لە ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لەسەر شۆڕشی کورد لەم ماوەیەدا بڵاوکراونەوە هەمەجۆر بوون، بەڵام بەشی زۆریان زیاتر باسیان لە هێز و شێوازی شەڕی شۆڕشگێرانی کورد کرد. لەم نێوەندەدا ئەو پەیامنێرانەی سەردانی ناوچە گەرمەکانی شەڕیان لە نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق کرد، زیاتر کەوتنە ژێر کاریگەری شێوازی شەڕی پێشمەرگە لەناو شاخەکان لە بەرامبەر بە سوپای عێراق. ئەو کاتەی شمیدت سەردانی ناوچەکانی کوردستانی کرد، وێنای توانا سەربازییەکانی هێزی پێشمەرگەی لە ڕاپۆرتێک نیشاندا و بڵاویکردەوە کە( پیادەکردنی شەڕی پارتیزانی لەلایەن کوردەکان، هاوکاری شۆڕشگێران دەکات لەشەڕ دژی سوپای عێراق). لەم ڕاپۆرتەدا پەیامنێرەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، جەنگاوەرە کوردەکان هەر لە منداڵییەوە، فێری بەکارهێنانی تفەنگ کراون. بەتایبەتی ئەوانەی لە دێهاتەکاندا ژیاون و گەورەبوون. ئەوان بۆ ماوەی (٢١) ڕۆژدەبێ، گەمارۆی هێزێکی حکومەتی عێراقیان داوە لەسەر ڕێگایەک، سەربازەکان توانای ڕزگاربوونیان نیە..(Schmidt, September 12, 1962.p.1,18)

لە درێژەی باسەکەیدا، ڕۆژنامەنووسەکە نووسیویەتی:"مستەفا بارزانی لە باکووری عێراق پێشەوایەتی هێزێکی پارتیزان دەکات. بەشێوەیەک لە (٢٤ی ئابی ١٩٦٢) دەستیکردوە بە پیادەکردنی شەڕی پارتیزانی بە پشتیوانی هێزی ژمارەیەک لە هۆزەکان. ئەمەش بۆ کوردەکان کارێکی سروشتییە"..(Schmidt, September 12, 1962.p.1,18)

ئەو ڕاپۆرتانەی ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لەسەر شۆڕشی کورد بڵاویکردنەوە، جگە لەلایەنی سەربازی، لایەنی سیاسیشی لەخۆ گرتبوو. وەک لە ڕاپۆرتی یەکێک لە پەیامنێرەکانیان بەناوی(سیمور توبینج) لە (١٥ی ئەیلوولی ١٩٦٢) دا هات، کە لە مۆسکۆی پایتەختی سۆڤیەت بەناوونیشانی (سوورەکانی عێراق داوای پەیوەندی لەگەڵ کورد دەکەن) ئامادەیکردووە، نووسیویەتی:" ئەم دیدارەی مەلا مستەفا بارزانی لە هاوینی ١٩٦٢ لەگەڵ پەیامنێری ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز ئەنجامیدا، بووە جێگەی بایەخی زۆربەی نێوەندە سیاسییەکان لە جیهان، بەتایبەتی وڵاتانی جەمسەری شەری سارد، لەمانەش یەکێتی سۆڤیەت. ئەم ڕاپۆرتە لە(١٥ی ئەیلولی ١٩٦٢) بڵاوکرایەوە، ئاماژەی بۆ ئەوە کرد:" حزبی شیوعی عێراق، هەوڵئەدات بۆ ئەوەی سنوورێک بۆ پرۆژەی (بەرەی نیشتمانی)10 عەبدوکەریم قاسم دابنێ، کە ئامانج تێیدا دژایەتیکردنی شۆڕشی کوردە، هاوکات مەبەستیانە پشتگیری لە داخوازییەکانی مەلا مستەفای بارزانی بکەن بۆ ئۆتۆنۆمی. ڕۆژنامەنووسەکە نووسیەتی بارزانی لەدوا دیداری لەگەڵ پەیامنێری تایمز باسی ئەوەی کردوە، ئەگەر ڕۆژئاوا یارمەتی پێشکەش بە شۆڕشەکەی نەکات، ناچار دەبێ داوای پشتیوانی لە یەکێتی سۆڤیەت بکات.(Topping, the New York Times, Sept. 15, 1962.p.1,2). ئەم هەواڵەش ڕەنگدانەوەی کاریگەریی بەهێزی شۆڕشی کورد لەسەر بەرژەوەندی هەردوو جەمسەری جەنگی سارد لە ناوچەکە نیسان ئەدات. کە ڕۆژنامەکە ڕۆڵی کاریگەریی لە قوڵکردنەوەی ململانێیەکان بینیوە و لەم نێوەندەشدا شۆڕشی کورد بۆ دروستکردنی پەیوەندی دیبلۆماسی و بەدەستهێنانی یارمەتی سەربازی و مرۆیی، سوودی زۆری لێوەرگرتووە.

## 3-2- ڕەنگدانەوەی پەیوەندییە ناوەخۆیی و دەرەکییەکانی شۆڕشی کورد

نائومێد بوونی سەرکردایەتی کورد لە بەدەستهێنانی پشتیوانی وڵاتانی ڕۆژئاوا بۆ شۆڕش، هۆکار بوو بۆ ئەوەی هەوڵبدەن هاوسۆزی و یارمەتی بلۆکی ڕۆژهەڵات، بەدەستبێنن، لەو کاتەی حکومەتی عێراق لەم ماوە مێژووییەدا لەلایەن یەکێتی سۆڤیەت پشتگیری دەکرا(علي، 2001،ص81). لەم سۆنگەوە لە (٢٣ی ئەیلولی ١٩٦٢) جارێکی دیکە ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی (دانا ئادامز شمیدت) لەبابەتێکی دیکەیدا بەناوونیشانی ( کوردەکان دەڵێن ئەوان یارمەتییەکانی سوور بەدەست دێنن) نووسیویەتی: هەردوو حزبی شیوعی لە عێراق و ئێران، پێشنیاریان بۆ ژەنەراڵ مەلا مستەفا بارزانی ڕێبەری کوردەکانی عێراق کردوە، پرۆسە سەربازییەکانی فراوان بکات بە ئاراستەی بەری باکووری ڕۆژئاوای ئێران بەرەو یەکێتی سۆڤیەت. ڕۆژنامەکە لەم بارەیەوە نووسیویەتی:" دیارە زانراوە کە حزبی شیوعی لە عێراق، لە مانگی نیسانی ١٩٦٢، خۆی لە ژەنەراڵ بارزانی نزیککردۆتەوە کە ئێستا لەپێناو ئۆتۆنۆمی شەڕ دەکات. بەڵام ڕێبەری کورد ڕەتیکردۆتەوە هیچ جموجۆڵێک بکات، ببێتە هۆی تێکدانی سەقامگیری ناوچەکە. دیارە هەواڵەکان بەو جۆرە گەیەندرانە ژەنەراڵ بارزانی، کە ئێران وەک ئەندامی هاوپەیمانی(CENTO)، مەبەستیەتی ڕێبەری شۆڕشگێرانی کورد لە عێراق گەمارۆ بدات. بەشێوەیەک ڕەنگە تورکیا و پاکستان هاوکاربن بۆ جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە. نەوەک پرۆسە سەربازییەکانی شۆڕشی کورد فراوان بێ، بە ئاراستەی بەری باکووری ڕۆژئاوای ئێران".(Schmidt, September 24, 1962, p. 10)

بارودۆخی شەڕ و هەوڵەکانی مەلا مستەفای بارزانی بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی نێودەوڵەتی بۆ شۆڕشی کورد بەم شێوەیەی هەبوو بەردەوام بوو، تا بڵاوبوونەوەی هەواڵی سەرکەوتنی کودەتای سەربازی لە (٨ی شوباتی١٩٦٣) لە عێراق11. ئەم هەواڵە بووە جێگەی بایەخی تەواوی ئاژانسەکانی هەواڵی جیهانی. ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمزی ئەمریکی لە چوارچێوەی بایەخدانی بە دۆزی کورد، یەکێک لەم دەزگایانە بوو بەگرنگییەوە بەدواداچوونی بۆ کاریگەریی ئەم پێشهاتە سیاسییە کرد لەسەر شۆڕشی کورد. لەم نێوەندەشدا (شمیدت) لە بابەتێکدا بەناونیشانی( سەرکردە کوردەکان، شاخەکان جێدەهێڵن بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەکانی ئاشتی لە بەغدا)، باسی لەوە کرد، پارتی دیموکراتی کوردستان جەلال تاڵەبانی ڕەوانەی بەغدا کردوە لەپێناو ئاشتی و دانوساندن لەگەڵ حکومەتی عێراق. وەک لە زانیارییەکانی پەیامنێری ڕۆژنامەکەدا هاتووە، شاندی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد بە فرۆکەیەک لە بەغدا دابەزیون و ڕاستەوخۆ دەستیان بە دانوستاندن کردوە. لەو گفتوگۆیانەی نێوان کورد و حکومەتی عێراق، شاندی کوردی داوای کشانەوەی هێزەکانی عێراقی کرد بۆ ئەو شوێنانەی بەر لە(١٩ی ئەیلولی١٩٦١) لەژێر دەستیان بووە. ڕۆژنامەنوسەکە نووسیویەتی:" پێناچێ سوپای عێراق بەو داواکاریە ڕازی بێت. بەڵام سەرباری ئەمە، کوردەکان لە گفتوگۆیەکانیان جەخت لەسەر سێ بژاردە دەکەنەوە، ئەمانیش ئۆتۆنۆمی بۆ ناوچە کوردییەکان لە چوارچێوەی عێراق. هەروەها دابەشکردنی داهاتی دەوڵەت بە نەوتیشەوە بەشێوەیەکی یەکسان و کشانەوەی هێزە عێراقییەکان لە کوردستان. پوختەی هەڵویستی کوردەکان، بریتی بوو لەوەی کوردەکان ئامادەن هەموو هەوڵێک بدەن بۆ پاراستن و پشتگیریکردنی ئەم حکومەتە، بەڵام بە هەر نرخێک بێت دەبێ پارێزگاری لە داواکانیان لە بارەی ئۆتۆنۆمی بکرێ. لەم بارەیەوە سەرچاوەیەکی کوردی بۆ ڕۆژنامەکەی ڕوونکردەوە ، ئۆتۆنۆمی بە تێگەیشتنی کورد لەو کاتەدا بە مانای ئیدارەیەکی کوردییە بۆ بەڕێوەبردنی ناوچە کوردییەکان. هەروەها سەرکردایەتی کورد داوا دەکات زمانی کوردی لە قوتابخانە کوردییەکان بخوێندرێت و ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانی دیکە بە زمانی کوردی بە ئازادی دابەش بکرێن. هێزێکی

ئاسایشی ناوخۆیی کوردی و تیپێکی سەربازی کوردی لە سوپای عێراق لە ناوچە کوردییەکان جێگیربکرێ". (Schmidt, February 18, 1963, p.1)

بەپێی زانیاری پەیامنێری ڕۆژنامەکە لە کوردستان، گفتوگۆیەکانی شاندی سەرکردایەتی کورد و حکومەتی عێراق، ئەو ئەنجامە دڵخۆشکەرەی بۆ سەرکردایەتی سیاسی کورد نەبوو، بۆیە لە ڕاپۆرتێکی دیکەیدا بەناوونیشانی ( کورد هەڕەشەی دەستپێکردنەوەی شەڕ دەکات)، نووسیویەتی:" مەلا مستەفا بارزانی ڕایگەیاندوە کە ئەمرۆ فەرمانی بە پیاوەکانی کردوە بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان، بۆئەوەی جارێکی دیکە بۆ شەڕ ئامادەبن، ئەگەر حکومەتی عێراق بەم زووانە داننەنێ بە مافی کورد لە ئۆتۆنۆمی". (Schmidt, The New York Times, March 2, 1963, p.1,2)

شمیدت، جگە لە وروژاندنی ئەو پرسیارانەی پەیوەندیان بە خواست و داواکاری سەرکردایەتی شۆڕشی کورد هەبوو، لە بەرامبەر بە حکومەتی عێراق، هەوڵیداوە، ببێتە پردێک بۆ گواستنەوەی دەنگی ڕێبەری کورد بۆ وڵاتانی زلهێزی خاوەن سەنگ و بڕیار، لە نێوەندە سیاسیە جیهانییەکان، لە مانەش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بۆیە هەر لە چوارچێوەی دیدارەکەیدا لەگەڵ بارزانی، پرسیارێک ئاڕاستەی ئەم ڕێبەرە دەکات بۆ تێگەیشتن لە هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەو قۆناغە هەستیارە بەرامبەر بە شۆڕشی کورد. وەک ڕۆژنامەنووسەکە نووسیویەتی ، مەلا مستەفا با ئازارەوە وەڵامی دایەوە و گوتی:" ئەگەر کەسێک بەدرێژایی تەمەنی کوێربێ، چۆن پیاو دەتوانێ پێشبینی ئەوەی لێبکات ئێستا ببینێ". دیارە ڕێبەری کورد لە بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە بەرامبەر بە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، لە ئەنجامی نائومێدی بووە بەرامبەر هەڵوێستی ئەم وڵاتە لە یارمەتیدانی کورد، بەتایبەتی دوای ئەو بانگەوازانەی بۆ یارمەتیدانی شۆڕشی کورد لە مانگی ئابی ١٩٦٢ ئاڕاستەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کردبوو فەرامۆشکران و بێ وەڵام بوون، بۆیە پێی وابوو ئیستا ناکرێ پێشبینی هەڵوێستێکی جیاوازی لێ بکەن و لەسەر ئەم بنەمایە، بارزانی بە ڕۆژنامەنووسەکەی ڕاگەیاندووە کە ئەوان:" داوای یارمەتیمان لەهەموو پیاوێکی شەریف کردوە لەهەموو جیهان، هەر کەسێ ئامادەیی یارمەتی کەسێکی دیکەی موحتاجی هەبێ، بەڵام لەبەدبەختی هیچ شتێکمان بەدەستنەهێنا". (Schmidt, The New York Times, March 2, 1963, p.1,2)

لەلایەکی دیکە سەرنەکەوتنی گفتوگۆی سەرکردایەتی سیاسی کورد و حکومەتی عێراق، ئەگەری هەڵگیرسانی شەڕی لە نێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگەی بەهێز کردەوە. بەپێی زانیاری پەیامنێری ڕۆژنامەکە لە کوردستانی عێراق، سەرکردایەتی سیاسی کورد، ئۆباڵی بەشێکی نەهامەتیەکانی کوردی خستە ئەستۆی حکومەتی ئەمریکا، لەبەرئەوەی ئامادەنبوو وەڵامی بانگەوازی ژەنەراڵ بارزانی لە مانگی ئابی ١٩٦٢ بداتەوە، بۆ یارمەتیدانی شۆڕشی کورد، بە پێچەوانەوە ئەوان پێیان وابوو ئەگەر شۆڕشگێرانی کورد، پشتیوانی حکومەتی ئەمریکایان بەدەست بهێنابوایە، ئێستا لە پێگەیەکی بەهێزتر دەبوون بەرامبەر بە حکومەتی عێراق و ئەگەری سەرکەوتنی گفتوگۆیەکانی سەرکردایەتی کورد لەگەڵ کاربەدەستانی بەغدا بەهێزتر بوو. ئەو کاتە پێگەی ئەمریکاش لەناوچەکە بەهێز دەبوو. بەپێی خەمڵێنی پەیامنێری ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمزی ئەمریکی بۆ بارودۆخی سیاسی و سەربازی ناوچەکە، هێزەکانی بارزانی ئەگەر جارێکی دیکە بچنە ناو شەڕەوە، لە کاتێکدا ژمارەیان بە نزیکەی (٢٠) هەزار کەسە، ڕەنگە بتوانن دەسەڵاتی خۆیان فراوان بکەن، بەجۆرێک دەست بەسەر نزیکەی هەموو ناوچە کوردنشینەکانی عێراق دابگرن و هێزە عێراقییەکانیش گۆشەگیر بکەن.(Schmidt, The New York Times, March 7, 1963, p. 6)

لەسەر ئەم بنەمایە، بەپێی زانیاری (شمیدت) ، بەشێک لە سەرکردەکانی شۆڕشی کورد گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە دەتوانن دەستبگرن بەسەر شارەکانی سلێمانی و هەولێر. سەبارەت بە شاری کەرکوکیش، کە کوردەکان مەبەستیان بوو بیکەنە پایتەختی هەرێمە خاوەن ئۆتۆنۆمیە چاوەڕوانکراوەکەیان، سەربازگەی سوپای عیراق تێیدا ئەوەندە گەورەبوو، مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم دۆخە، توانای زیاتری سەربازی پێویست بوو. بەهەر جۆرێک بێت پەیامنێرەکەی ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز، پێی وابوو قسەکردن لەسەر دەستبەسەرداگرتنی شارەکان، پێچەوانەی شێوازی شەڕی خۆبەدوورگرتنی پێشووتری شۆڕشگێرە کوردەکان بوو لەم ماوەیەدا. دیارە پێشتر هێزەکانی پێشمەرگە، دوو دڵیان لەوە هەبوو بتوانن پێداویستی خەڵکی سڤیل دەستەبەر بکەن و مەترسیان لەوە هەبوو خەڵکی سڤیلی دانیشووی کوردستان ڕووبەڕووی بۆردومانی سوپای عێراق ببنەوە، لەو کاتەیدا هێزەکانی پێشمەرگە هیچ چەکێکی دژە فرۆکەیان نەبوو. بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکە، ئەگەری زۆر هەیە، هێزەکانی پێشمەرگە لەکاتی دەستپێکردنەوەی شەڕ، ئەمجارە گورزی کاریگەر لە سوپای عێراق بوەشێنن، لەڕێگەی هەوڵدان بۆ پەکخستنی بیرە نەوتیەکانی نزیک سلێمانی و موسڵ. بەپێی زانیاری پەیامنێرەکە، ئەگەر هێزەکانی پێشمەرگە ئەو چالاکیانە ئەنجام بدەن، دەتوانن ڕێگری بکەن لە ڕۆیشتنی نەوت، ئەمەش وەک ڕێگەیەک بۆ فشار دروستکردن لەسەر حکومەتی عێراق. هەر لەم چوارچێوەیەشدا هێزە کوردییەکان دوو بەرپرسی کۆمپانیای نەوتی

عێراقیان ڕفاند و هەندێ بۆری نەوتی بچووکیان تەقاندەوە و هۆشدارییان بە باڵیۆزخانەی ئەمریکا و بریتانیا و فەرەنسا لە بەغدا داوە، ئەگەر خەڵکی بیانی لە کێڵگە نەوتیەکان کار بکەن، سزایان دەدەن.(Schmidt, The New York Times, March 7, 1963, p. 6)

### ٣- ڕۆڵی ڕۆژنامەکە لە خستنەڕووی هەڵوێستی سیاسی نێودەوڵەتی بەرامبەر دۆزی کورد

ڕۆژنامەکە هاوشێوەی هەر دامەزراوەیەکی سیاسی فەرمی، بەپێی بەرژەوەندی وڵاتەکەی و سیاسەتەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست، کاریکردوە بۆ خستنەڕووی کاریگەرییەکانی شۆڕش لەسەر دۆزی کورد لە عێراق، وەک لە خوارەوە باسی دەکەین:

#### ٣-١- خستنەڕووی هەڵوێستی نێودەوڵەتی بەرامبەر بە دۆزی کورد

نائومێد بوونی سەرکردایەتی شۆرشی کورد لە بەدەستهێنانی پشتیوانی ئەمریکا و وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا، کاریگەریی هەبوو لەسەر چڕکردنەوەی هەوڵەکانیان بۆ نزیکبوونەوە لە یەکێتی سۆڤیەت. ئەم ئامانجەشیان لە چوارچێوەی بابەتێکی ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی سیمور توپینج(Seymour Topping)9 بەناوونیشانی (مۆسکۆ پشتیوانی لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لە عێراق دەکات) کە لە ڕۆژی (٦ی ئایاری ١٩٦٣) بڵاوکراوەتەوە، بۆمان ئاشکرا دەبێ، کە بەرهەمداربووە. وەک ڕۆژنامەنووسەکە باسی دەکات کە:" حزبی شیوعی سۆڤیەتی ئەمڕۆ پشتیوانی خۆی بۆ خەباتی هێزە شۆڕشگێرە کوردیەکان بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا بارزانی ڕاگەیاند، کە لەپێناو بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی لە عێراق شەڕ دەکەن" .(Topping, May 7, 1963.p. 1)

ئەمەش دەرەنجامێکی ئەرێنی بوو، بۆ خەباتی ڕزگاریخوازی کورد لە عێراق. بەتایبەتی دوای ئەوەی ئەم ڕۆژنامەنووسە ئەوەی بۆ ڕوونکردینەوە، کە هەڵوێستی پشتگیریکردنی شۆڕشی کورد لە سۆڤیەت، ئاڕاستەیەکی گشتگیری وەرگرتووە و تەنانەت دەزگا ڕۆژنامەوانییەکانی سۆڤیەت، توندتر لەدامەزراوە فەرمییەکانی ئەم وڵاتە هاتونەتە سەر خەت، بۆ شەرمەزارکردنی دەسەڵاتدارانی بەغدا، بەهۆی بەکارهێنانی توندوتیژی لەپێناو سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد. لەم سۆنگەوە نووسیویەتی:"براڤدا سەرکۆنەی سیاسەتی تیرۆر و تۆقاندنی حکومەتی نوێی عێراق دەکات" . لەلایەکی دیکە ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانیەکە حکومەتی عێراق تۆمەتبار کردوە بە ساردی نواندن بەمەبستی درێژکردنەوەی دانوستانەکان لەگەڵ کورد سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی. لەسەر زاری نوێنەرانی کورد ڕۆژنامەکە ئەوەی گواستۆتەوە، کە نوێنەرانی کورد سکاڵایان لەوە کردوە، ئەم پرۆسەیە ئامانجی سەرکوتکردنی ئەو جولانەوەیە، کە داوای ئۆتۆنۆمی دەکات. دیارە بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکە، پسپۆرانی دیپلۆماسی ڕۆژئاوا ڕێبازی نوێی سۆڤیەتیان بۆ مەلا مستەفا بە هەوڵێک بۆ هاندانی دروستکردنی بنکەیەکی سیاسی نوێی لایەنگری کۆمۆنیست لە عێراق لێکدایەوە. ئەمەش لە ڕێگەی هاوپەیمانی نێوان هێزەکانی مەلا مستەفا لە باکووری عێراق و حزبی شیوعی قەدەغەکراو لەم وڵاتە. هەروەها ئەو بابەتە وەک هۆشدارییەک بۆ حکومەتی عێراق سەیر دەکرا، کە ئەگەر بێت و هەڵوێستێکی کەمتر دوژمنکارانە بەرامبەر بە شیوعیەکان نەگرێتەبەر، لەوانەیە دواجار ڕووبەڕووی بەرنامەیەکی چالاکی هاوکاری سۆڤیەت بێتەوە بۆ کورد. سیاسەتەکانی حکومەتی نوێ پێگەی سۆڤیەت لە عێراقدا تێکدا. ئەم پێگەیە بە گەیاندنی (٥٠٠) ملیۆن دۆلار هاوکاری سەربازی و ئابووری بۆ ڕژێمی پێشوو واتە ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم سەرۆک وەزیران بنیات نرابوو. پراڤدا لە ئاماژەیەکدا بۆ ناسیۆنالیستە عەرەبەکان کە ناڕەزایی دەردەبڕن لە دەستوەردانی دەرەکی لە پرسی کورددا، وتی:" هیواداوە کێشەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی نوێی فیدراڵیدا چارەسەرێکی دادپەروەرانە بدۆزێتەوە". (Topping, May 7, 1963.p. 1,11)

لە لایەکی دیکە ڕۆژنامەکە لەدوای دەستپێکردنەوەی دانوستانەکانی نێوان کورد و حکومەتی عێراقی لە ( ١٠ی شوباتی ١٩٦٤)، لە ڕاپۆرتە هەواڵێکدا هەڵویستی وڵاتێکی عەرەبی وەک میسری بە ڕوونی نیشانداوە، کە لەگەڵ چارەسەرکردنی پرسی کوردە لە عێراق. ئەمەشی. لەم ڕاپۆرتە هەواڵەدا خستۆتەڕوو کە ڕۆژنامەنووس دانا ئادامز شمیدت بەناوونیشانی (بزووتنەوەکانی کورد و یەمەن هەڕەشەن بۆ سەر ئیسرائیل) ئامادەیکرد. نووسیویەتی:" حکومەتی عێراق لە ژێر فشاری سەرۆکی میسر جەمال عەبدولناسر، چۆتە ژێر باڵی دانوستاندن و گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی کورد بۆ دانپێدانان بە مافەکانی ئەم پێکهاتە نەتەوەییە لە وڵاتەکەیدا".( SCHMIDT, February 12, 1964, p.6). دیارە خستنەڕووی ئەم پشتیوانییە عەرەبی و ڕۆژئاواییانە لە دۆزی کورد لە عێراقدا، وێنای ڕەوایەتی داخوازییەکانی گەلی کوردی نیشانی جیهاندا، کە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەو ماوەیەدا وەک پێویستییەکی سیاسی کاریگەر سەیری دەکرد.

دوای ماوەیەکی کورت، ڕۆژنامەکە پوختەی داواکارییەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی لە چوارچێوەی دانوستانەکانیان لەگەڵ حکومەتی عێراق لە ڕاپۆرتە هەواڵێکدا بڵاوکردەوە، بۆ ئاشناکردنی ڕای گشتی جیهانی بە داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کورد. لەم نێوەندەشدا دوای ئاماژەکردن بە دەستپێکردنەوەی دانوستاندن لە نێوان شاندی کوردی بەسەرۆکایەتی جەلال تالەبانی و کاربەدستانی بەغدا لە (شوباتی ١٩٦٤)، ڕۆژنامەکە دیارترین خاڵەکانی داواکاری سەرکردایەتی کورد بوون بڵاوکردەوە، لە مانەش:

١-دامەزراندنی ناوچەی خاوەن ئۆتۆنۆمی لە باشووری کوردستان، کە ڕۆژنامەکە بە باکووری عێراق ناساندویەتی. بەشێوەیەک ناوچەی ئۆتۆنۆمی خاوەنی دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندنی تایبەت بە خۆی بێت.

٢-دامەزراندنی جێگرێکی کورد بۆ سەرۆک کۆماری عێراق.

دواتر ڕۆژنامەکە هەر لەم ڕاپۆرتەدا بە ئامانجی ئاشناکردنی خوێنەرانی، بە هەڵوێستی ڕێبەری شۆڕشی کورد لەسەر دانوستانەکانی سەرکردایەتی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراق، ئاماژەی بۆ دیدارێکی پەیامنێری ڕۆژنامەکە لەگەڵ بارزانی کرد و بڵاویکردەوە کە مەلا مستەفا بارزانی پێی وایە ئەگەر حکومەتی عێراق دان بە مافە نەتەوەییەکانی کورد نەنێ، جارێکی دیکە شەڕ هەڵدەگیرسێتەوە، بەڵام هەرکاتێ بگەنە ڕێککەوتن، ئامادەیە هێزەکانی هەڵبوەشێنێتەوە و کۆتایی بەشەڕ بهێنێ.( The New York Times, Feb. 16, 1964, p.20). ئەمەش وێناکردنی خواستی ئاشتیخوزانەی سەرکردایەتی کورد بوو، لە شۆڕشەکەی لە پێناو بەدەستهێنانی داوا نەتەوەییەکانی گەلەکەیان هەڵیانگیرساند.

### 2-3- هەڵوێستی ڕۆژنامەکە بەرامبەر دۆزی کورد (١٩٦٤-١٩٦٨)

ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز، ئەگەرچی لە چوارچێوەی بەرژەوەندی و سیاسەتی دەرەکی وڵاتەکەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست، کاریکردوە بۆ گواستنەوەی هەواڵەکانی تایبەت بوون بە دۆزی کورد لە عێراقدا، بەڵام لەهەمان کاتدا، هەوڵیداوە پارێزگاری لە کاری پیشەییانەی خۆی و مکۆمی هەواڵەکانی بکات، لە پێناو پاراستنی متمانەی خوێنەرانی. سەرباری ئەوەی ڕۆژنامەکە وەک نیوەندێکی ڕۆژنامەگەری جیهانی باوەڕپێکراو، هەوڵیداوە خۆی لە ڕێگەی سەرچاوەکانی هەواڵ و زانیاری کە لەپەیامنێرەکانیەوە لە بەیروت و تاران و بەغدا و هەندێکجاریش لەناو جەرگەی ڕووداوەکان لەناوچە ئازادکراوەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕشی کورد بەدەستی گەیشتوون، ببێتە سەرچاوەی هەواڵ و زانیاری بۆ هەموو ئاژانسە هەواڵیە جیهانییەکان. ئەمەشمان لە زۆربەی ڕاپۆرت و بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان تێبینی کرد بەدرێژایی ماوەی شۆڕشی کورد (شمیدت ،٢٠٠٩، ل٢٥)

لەم باسەدا مەبەستمان زیاتر ئەوەیە، ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە ڕۆژنامەکە هەرچی زانیاری لەسەر بارودۆخی شۆڕش و داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لەم ماوە مێژووییەدا خستیەروو، ئامانج لێی گواستنەوەی دیوی ڕاستی ڕووداوەکان بووە، دوور لەو چەواشەکارییانەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی حکومەتی عێراق بەئامانجی ناشرینکردن و لەکەدارکردنی شۆڕش و داخوازییە نەتەوەییەکانی کورد بڵاویان دەکردەوە و زۆربەی کات ئەو زانیاریانەش لەلایەن زۆرێک لە دەزگا ڕۆژنامەوانییە جیهانییەکان، بونەتە سەرچاوەی هەواڵ و زانیارییەکانی بڵاویان کردۆتەوە. بەڵام نیویۆرک تایمز، پێچەوانەی ئەو ئاڕاستەیە کاریکردوە و چۆن بۆتە نێوەندێک بۆ گەیاندنی دەنگی شۆڕشگێرانی کورد لە نێو چیاکانی کوردستان بە جیهان، هاوکات بۆتە نێوەندێک بۆ ئاشناکردنی ڕای گشتی بە سیاسەتی حکومەتی عێراق بە پێکهاتەیەکی نەتەوەیی وەکو کورد، کە دوور بووە لە هەموو بنەما دیموکراسییەکان، لە پێناو کپکردنی دەنگی ئەم گەلە، بەم شێواز و میکانیزمە سیاسی و سەربازییانەی، بۆ پێکاندنی ئەم ئامانجە بەکاریان هێنا.(بڕوانە: NAA: A1838, PART2, Iraq- Political States- Kurds, p.330).

هەڵوێستی ڕۆژنامەکە ئەو کاتە ڕوونتر خۆی نیشان ئەدات، کاتێک لە شیکردنەوەی کتێبێکی ڕۆژنامەنووسی دیاری ئەمریکی (دانا ئادامز شمیدت) بەناوونیشانی (سەفەرێک بۆ ناو پیاوە ئازاکانی کوردستان) کە یەکێک بووە لەم پەیامنێرانەی سەردانی کوردستانی کردوە نووسیویەتی:" شمیدت پشتیوانێکی سەرسەختی دۆزی کوردە لەسەر بنەمای تێوری مافی چارەی خۆنووسینی گەلانی سەرۆکی ئەمریکا ویلسۆن لە پێشتردا ڕایگەیاندوە". ئەو پێی وایە، بەلایەنی کەمەوە، کوردەکانی دانیشتووی عێراق، تورکیا، ڕووسیا و ئێران، پێویستە ڕێگەیان پێبدرێت دەسەڵاتی خۆبەڕێوەبەری خۆیان هەبێ و بتوانن بە زمانەکانی خۆیان قسە بکەن و بە پێی داب و نەریتی خۆیان بژین.( MORRIS, June 28, 1964, p.74)

### 3-3- گواستنەوەی دەنگ و داخوازی کورد بۆ نێوەندە جیهانییەکان

ناساندن و خستنەڕووی دۆزی کورد لەبەردەم ڕای گشتی نێودەوڵەتی، یەکێک بووە لەم سوودە بەنرخانەی، ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لەم ماوە مێژووییەدا بە دۆزی کوردی گەیاندووە. لەڕێگەی بڵاوکردنەوەی وتار و دیارە ڕۆژنامەوانی و بڵاوکراوە و نووسراوە سیاسییەکانی سەرکردایەتی کورد. نمونەی ئەم هەڵوێستەی ڕۆژنامەکەش بەدرێژایی ماوەی توێژینەوەکەمان زۆرو هەموو جۆر بوون. وەک هەواڵی بانگەوازەکانی سەرکردایەتی کورد بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی سیاسی و یارمەتی مرۆیی بۆ شۆڕش و خەڵکی کوردستان، کە ئاڕاستەی دامەزراوە سیاسی و ڕێکخراوە خێرخوازییە نێودەوڵەتییەکانی دەکردن. بۆ نمونە لەو کاتەی سەرکردایەتی سیاسی کورد، لە ساڵی ١٩٦٥ پەنای بۆ کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتوەکان برد بۆ چارەسەرکردنی دۆزی کورد. ڕۆژنامەکە لە چوارچێوەی بابەتێکیدا بەناوونیشانی :"کورد بانگەوازی خۆی بۆ جیهان نوێ دەکاتەوە؛ بارزانی داوای هاوکاری نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات بۆ

چارەسەرکردنی "پرسی نەتەوەیی". ڕۆژنامەکە دەقی داواکارییەکەی مەلا مستەفا بارزانی بڵاوکردۆتەوە، کە لە سەرەتاکەیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات:" ژەنەڕاڵ مستەفا بارزانی، سەرۆکی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی کورد لە باکووری عێراق، بانگەوازی بۆ وڵاتانی دۆست و نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات "ڕێگری لە شەڕێکی دیکە بکەن و دۆزی نەتەوەییان چارەسەر بکەن".( The New York Times, January 24, 1965, p.24). بەم جۆرەش ڕۆژنامەکە بە دوو شێوە خزمەتی بە دۆزی کورد و بزووتنەوەکەی کردووە، یەکەمیان لە ڕێگەی خستنەڕووی داوکاری سەرکردایەتی کورد بۆ چارەسەرکردنی پرسی نەتەوەییان لە عێراق، دووەمیان، نیشاندانی کورد وەک گەلێکی ئاشتیخواز لەناوچەکە. پێچەوانەی بانگەشەکانی لەلایەن نەیارانی ئەو گەلەوە بڵاودەکرانەوە، کە هەمیشە وەک شەڕخواز و پیکهاتەیەکی توندوتیژ وێنایان کردوە.

ڕۆژنامەکە لەسەر ئەم ئاڕاستەیە بەردەوام بوو، تەنانەت لەکاتی گواستنەوەی هەواڵەکانی تایبەت بوون بەشەڕ و پێکدادانە سەربازییەکانی نێوان سوپای عێراق و هێزی پێشمەرگە. ئەم بابەتەشمان لە گواستنەوەی هەواڵی ئەو پرۆسە سەربازییە بەرفراوانەی سوپای عێراق بۆ سەر هێزەکانی پێشمەرگە لە(ئایاری ١٩٦٦) لە بابەتێکی ڕۆژنامەکە بەناونیشانی(هێرشی عێراق لەلایەن کوردەوە پووچەڵکرایەوە) تێبینی کرد، کە تیایدا هاتووە:" کوردەکان داوایان لە خاچی سووری نێودەوڵەتی کردووە ئاگربەست ڕێکبخات بۆ ئەوەی تەرمی ئەو سەربازە عێراقییانەی لەمەیدانی جەنگ بە جێماون لە بناری چیای هەندرێن لە جەرگەی ڕەواندوز دەربهێنرێنەوە و بگوازرێنەوە بۆ زێدی خۆیان.( SCHMIDT, May 29, 1966, p.6 ).

لەلایەکی دیکە ڕۆژنامەکە لە ڕێگەی نیشاندنی ئامادەیی سەرکردایەتی کورد بۆ ئاشتی و دۆزینەوەی چارەسەرێکی دادپەروەرانە بۆ دۆزی کورد، کاریکردوە بۆ دروستکردنی هاوسۆزی نێودەوڵەتی بۆ دۆزی کورد لە عێراقدا. بۆ نمونە ئەو کاتەی ڕۆژنامەکە هەواڵی دەستپیشخەری سەرۆک وەزیرانی عێراق عەبدولروحمان بەزاز لە (٣٠ی حوزەیرانی ١٩٦٦) بڵاوکردەوە، لە بابەتێکدا بەناوونیشانی (کورد ڕازین بە ئاشتی؛ سەرۆکوەزیران پلانێک ڕادەگەیەنێت کە لەسەر بنەمای خۆبەڕێوەبەری ناوخۆیی دامەزراوە)، کە ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی توماس ف. برادي(THOMAS F. BRADY) لە بەیروتی پایتەختی لوبنانەوە ئامادەیکرد بوو، نووسیویەتی:" عەبدولڕەحمان بەزاز (١٩٦٥-١٩٦٦) ، سەرۆک وەزیرانی عێراق ئەمشەو لە وتەیەکی ڕادیۆیی لە بەغداوە پلانێکی بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕی پێنج ساڵە لەگەڵ کوردەکان لە بەشی باکووری وڵاتەکەی ڕاگەیاند. دواتر لەو شەوە ڕادیۆی بەغدا ڕایگەیاند کە عەبدوڵڕەحمان عارف سەرۆک کۆمار و بەزازی سەرۆک وەزیرانی عێراق، بروسکەیەکیان لە ژەنەراڵ مستەفا بارزانی، ڕێبەری کوردەکان وەرگرتووە، کە پلانی سەرۆک وەزیرانیان پەسەند کردووە و ئەو جۆرە پەیامانەش مانای ئەوە دەگەیەنن کە ئاشتی بەدیهاتوو.( BRADY, June 30, 1966, p.4)

نیشاندانی خواستی سەرکردایەتی کورد بۆ ئاشتی و بەدیهێنانی سەقامگیری لە عێراق و ناوچەکە، لەدرێژەی باسەکانی ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لە بابەتێکی دیکەی تایبەت بوو بەسەردانیکردنی سەرۆک کۆماری عێراق، عەبدوڵرەحمان عارف لە (٢٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٦) بۆ لای مەلا مستەفا بارزانی ڕێبەری شۆڕشی کورد، لەبابەتێکدا بەناوونیشانی (بەغدا ڕایدەگەیەنێت کە سەرکردەی کورد لەگەڵ سەرۆک کۆماری عێراق کۆدەبێتەوە)، دووپاتکرایەوە، کە تیایدا باس لەوە دەکات:" ئێزگەی بەغدا ئەمشەو ڕایگەیاند، عەبدولڕەحمان عارف، سەرۆک کۆماری عێراق و ژەنەڕاڵ مستەفا بارزانی، ڕێبەری شۆڕشگێرانی کورد کە بەدوای بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمین بۆ ناوچەکانیان، ئەمڕۆ کۆبوونەوە. ئێزگەکە ئاماژەی بەوەشکردووە، سەرۆک عارف لە ڕواندز لە باکوری عێراق لە بارەگای فیرقەی یەکەمی سوپای عێراق پێشوازی لە ژەنەڕاڵ بارزانی کردووە. لە پەخشەکەدا ئاماژە بەوە کراوە، کە وەک میوانی فەرماندەی فیرقەی یەکەم پێکەوە نانی نیوەڕۆیان خواردووە و دیارییان ئاڵوگۆڕ کردووە. هیچ باسێک لە ئاڵوگۆڕی بیروڕای سیاسی نەکرا. ئەمەش یەکەم دیداری بارزانی بوو لەگەڵ سەرۆک کۆماری عێراق لە دوای دەستبەکاربوونی ژەنەراڵ عارف لە مانگی نیسانی ڕابردوودا. ئاگربەستێکی نائارام لە نێوان سوپا و شۆڕشگێرانی کورددا زاڵ بووە لەو کاتەوەی حکومەتی عێراق لە(٢٩ی حوزەیران) بەرنامەیەکی ١٢ خاڵیی بۆ پێدانی ئۆتۆنۆمی بە کوردەکان ڕاگەیاند. (The New York Times, October 29, 1966, p.5)

لەلایەکی دیکە، ڕۆژنامەکە بە سوود وەرگرتن لە زانیاری نوێنەرانی کورد لە ڕۆژئاوای ئەوروپا، لە باسێکی تایبەت بە داخوازی کورد بۆ یارمەتیدانی قوربانیانی شەڕ، هەواڵێکی لە (٣١ی کانونی دووەمی ١٩٦٧) بەناوونیشانی (کورد داوای هاوکاری دەکات بۆ قوربانیانی شەڕ) بڵاوکردۆتەوە، کە تیایدا هاتووە:" مستەفا بارزانی ڕێبەری کورد، سوودی لە هێوربوونەوەی شەڕی پێنج ساڵەی نێوان کورد و حکومەتی عێراق وەرگرت و هەڵمەتێکی نێودەوڵەتی بۆ یارمەتیدانی قوربانیانی شەڕ دەستپێکرد".( The New York Times, January 31, 1967, p.14). بەم شێوەیە ڕۆژنامەکە، لەپاڵ هەوڵی سەرکردایەتی کورد بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی، کاریکرد بۆ دورستکردنی هاوسۆزی نێودەوڵەتی لەگەڵ دۆزی کورد لە عێراق.

باسێکی دیکەی ڕۆژنامەکە بە ئامانجی نیشاندانی سەرپێچییە سیاسیەکانی حکومەتی عێراق بەرامبەر ماف و جیاوگە نەتەوەییەکانی کورد خستیە بەردەم رای گشتی جیهانی، هەوڵی دەسەلاتدارانی بەغدا بوو بۆ بەردەوامیدان بە پرۆسەی بەعەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان، بە ئامانجی بچووککردنەوەی سەنگ و ژمارەی کوردەکان ، لەو ناوچانەی دەولەمەندبوون بەسامانی سروشتی. ئەم بابەتەشی بە ناوونیشانی (هۆزە عەرەبیەکان لەلایەن حکومەتی عێراق دەگوازرێنەوە کوردستان؛ ئەم هەنگاوە هەوڵێکە بۆ ڕێگریکردن لە شۆڕشی نوێ بەدوای سەربەخۆیی ناوخۆییدا) بڵاوکردەوە. کە تیایدا باس لەوە دەکات کە:" حکومەتی عێراق بۆ ڕێگریکردن لە نوێبوونەوەی شۆڕشی کورد، دەستیکردووە بە گواستنەوەی بەکۆمەڵی هۆزە عەرەبیەکان بۆ دەوروبەری شاری هەولێر، ئەو ناوچەیە کوردەوارییە دیمەندارەی کە بە باخەکانی هەنار بەناوبانگە. ئەم سەرچاوانە کە ئامادە نەبوون ناسنامەی خۆیان بۆ بڵاوکردنەوە ئاشکرا بکەن، ئاماژەیان بەوە کردووە کە ئامانجی ئەم هەنگاوە هێورکردنەوەی کەمینە توندڕەوەکەی کوردە، کە ئێستا هەڕەشەی دەستپێکردنەوەی یاخیبوونی پێنج ساڵەی خۆیان لە دژی حکومەتی بەغدا دەکەن. شەڕەکە دوای ڕێککەوتنی ئاگربەست لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ کۆتایی هات. کوردەکان مەبەستیانە ئۆتۆنۆمی خۆجێیی لە چوارچێوەی عێراق و پشکی زیاتر لە سەروەت و سامانی نەوتی وڵات بەدەستبێنن. ژەنەراڵ بارزانی دەیەوێت هەولێر کە بە حەوزی ماسی و بەرازی کێوی ناسراوە، ڕزگاری بێت لەو ٣٥ هەزار هۆزە عەرەبەی، حکومەتی پێشووی بەغدا لە هەوڵێکدا بۆ تێکدانی ژمارەی کورد لەوێ نیشتەجێی کردوون".( PACE, October 3, 1967, p.10)

دواجار ڕۆژنامەکە لەماوەی توێژینەوەکەماندا، بابەتێکی بەناوونیشانی (هەواڵی درزێکی نوێ لە نێوان بەغدا و کورد) لە (٩ی ئابی ١٩٦٨) بڵاوکردەوە، کە تیایدا نووسەری بابەتەکە(توماس ف. برادی) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە سەرچاوە ئاگادارەکانی کورد لە بەیروتی پایتەختی لوبنان ڕایانگەیاند پەیوەندی نێوان کورد و حکومەتی عێراق ماوەی سێ هەفتەیە بەشێوەیەکی بەرچاو خراپ بووە. ئەمەش ئاماژە و نیشانەیەکی ڕوون بوو بۆ سەرهەڵدانەوەی ئالۆزییە سیاسی و سەربازییەکانی نێوان هەردوولا و کۆتاییهاتنی سەردەمی ئاشتی و سەقامگیری لە عێراق.

نائومێد بوونی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لە بەدەستهێنانی پشتیوانی ئەمریکا و وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا، کاریگەریی هەبوو لەسەر چڕکردنەوەی هەوڵەکانیان بۆ نزیکبوونەوە لە یەکێتی سۆڤیەت. ئەم ئامانجەشیان لە چوارچێوەی بابەتێکی رۆژنامەنووسی ئەمریکی سیمور توپینج(Seymour Topping)9 بەناوونیشانی (مۆسکۆ پشتیوانی لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی لە عێراق دەکات) کە لە ڕۆژی (٦ی ئایاری ١٩٦٣) بڵاوکراوەتەوە، بۆمان ئاشکرا دەبێ، کە بەرهەمداربووە. وەک ڕۆژنامەنووسەکە باسی دەکات کە:" حزبی شیوعی سۆڤیەتی ئەمڕۆ پشتیوانی خۆی بۆ خەباتی هێزە شۆڕشگێرە کوردیەکان بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا بارزانی ڕاگەیاند، کە لەپێناو بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی لە عێراق شەڕ دەکەن" .(Topping, May 7, 1963.p. 1)

ئەمەش دەرەنجامێکی ئەرێنی بوو، بۆ خەباتی رزگاریخوازی کورد لە عێراق. بەتایبەتی دوای ئەوەی ئەم ڕۆژنامەنووسە ئەوەی بۆ ڕوونکردینەوە، کە هەڵوێستی پشتگیریکردنی شۆڕشی کورد لە سۆڤیەت، ئاڕاستەیەکی گشتگیری وەرگرتووە و تەنانەت دەزگا ڕۆژنامەوانییەکانی سۆڤیەت، توندتر لەدامەزراوە فەرمییەکانی ئەم وڵاتە هاتونەتە سەر خەت، بۆ شەرمەزارکردنی دەسەڵاتدارانی بەغدا، بەهۆی بەکارهێنانی توندوتیژی لەپێناو سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد. لەم سۆنگەوە نووسیویەتی:"براڤدا سەرکۆنەی سیاسەتی تیرۆر و تۆقاندنی حکومەتی نوێی عێراق دەکات" . لەلایەکی دیکە ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانیەکە حکومەتی عێراق تۆمەتبار کردوە بە ساردی نواندن بەمەبستی درێژکردنەوەی دانوستانەکان لەگەڵ کورد سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی. لەسەر زاری نوێنەرانی کورد ڕۆژنامەکە ئەوەی گواستۆتەوە، کە نوێنەرانی کورد سکاڵایان لەوە کردوە، ئەم پرۆسەیە ئامانجی سەرکوتکردنی ئەو جولانەوەیە، کە داوای ئۆتۆنۆمی دەکات. دیارە بەپێی زانیاری ڕۆژنامەکە، پسپۆڕانی دیپلۆماسی ڕۆژئاوا ڕێبازی نوێی سۆڤیەتیان بۆ مەلا مستەفا بە هەوڵێک بۆ هاندانی دروستکردنی بنکەیەکی سیاسی نوێی لایەنگری کۆمۆنیست لە عێراق لێکدایەوە. ئەمەش لە ڕێگەی هاوپەیمانی نێوان هێزەکانی مەلا مستەفا لە باکووری عێراق و حزبی شیوعی قەدەغەکراو لەم وڵاتە. هەروەها ئەو بابەتە وەک هۆشدارییەک بۆ حکومەتی عێراق سەیر دەکرا، کە ئەگەر بێت و هەڵوێستێکی کەمتر دوژمنکارانە بەرامبەر بە شیوعیەکان نەگرێتەبەر، لەوانەیە دواجار ڕووبەڕووی بەرنامەیەکی چالاکی هاوکاری سۆڤیەت بێتەوە بۆ کورد. سیاسەتەکانی حکومەتی نوێ پێگەی سۆڤیەت لە عێراقدا تێکدا. ئەم پێگەیە بە گەیاندنی (٥٠٠) ملیۆن دۆلار هاوکاری سەربازی و ئابووری بۆ ڕژێمی پێشوو واتە ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم سەرۆک وەزیران بنیات نرابوو. پراڤدا لە ئاماژەیەکدا بۆ ناسیۆنالیستە عەرەبەکان کە ناڕەزایی دەردەبڕن لە دەستوەردانی دەرەکی لە پرسی کورددا، وتی:" هیوادارە کێشەی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی نوێی فیدراڵیدا چارەسەرێکی دادپەروەرانە بدۆزێتەوە".
(Topping, May 7, 1963.p. 1,11)

لە لایەکی دیکە ڕۆژنامەکە لەدوای دەستپێکردنەوەی دانوستانەکانی نێوان کورد و حکومەتی عێراقی لە ( ١٠ی شوباتی ١٩٦٤)، لە ڕاپۆرتە هەواڵێکدا هەڵویستی وڵاتێکی عەرەبی وەک میسری بە ڕوونی نیشانداوە، کە لەگەڵ چارەسەرکردنی پرسی کوردە لە عێراق. ئەمەشی. لەم ڕاپۆرتە هەواڵەدا خستۆتەڕوو کە ڕۆژنامەنووس دانا ئادامز شمیدت بەناوونیشانی (بزووتنەوەکانی کورد و یەمەن هەڕەشەن بۆ سەر ئیسرائیل) ئامادەیکرد. نووسیویەتی:" حکومەتی عێراق لە ژێر فشاری سەرۆکی میسر جەمال عەبدولناسر، چۆتە ژێر باڵی دانوستاندن و گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی کورد بۆ دانپێدانان بە مافەکانی ئەم پێکهاتە نەتەوەییە لە وڵاتەکەیدا".( SCHMIDT, February 12, 1964, p.6). دیارە خستنەڕووی ئەم پشتیوانییە عەرەبی و ڕۆژئاواییانە لە دۆزی کورد لە عێراقدا، وێنای ڕەوایەتی داخوازییەکانی گەلی کوردی نیشانی جیهاندا، کە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەو ماوەیەدا وەک پێویستییەکی سیاسی کاریگەر سەیری دەکرد.

دوای ماوەیەکی کورت، ڕۆژنامەکە پوختەی داواکارییەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی لە چوارچێوەی دانوستانەکانیان لەگەڵ حکومەتی عێراق لە ڕاپۆرتە هەواڵێکدا بڵاوکردەوە، بۆ ئاشناکردنی ڕای گشتی جیهانی بە داخوازییە نەتەوەییەکانی گەلی کورد. لەم نێوەندەشدا دوای ئاماژەکردن بە دەستپێکردنەوەی دانوستاندن لە نێوان شاندی کوردی بەسەرۆکایەتی جەلال تالەبانی و کاربەدستانی بەغدا لە (شوباتی ١٩٦٤)، ڕۆژنامەکە دیارترین خاڵەکانی داواکاری سەرکردایەتی کورد بوون بڵاوکردەوە، لە مانەش:

1-دامەزراندنی ناوچەی خاوەن ئۆتۆنۆمی لە باشووری کوردستان، کە ڕۆژنامەکە بە باکووری عێراق ناساندویەتی. بەشێوەیەک ناوچەی ئۆتۆنۆمی خاوەنی دەسەڵاتی یاسادانان و ڕاپەڕاندنی تایەبت بە خۆی بێت.

2-دامەزراندنی جێگرێکی کورد بۆ سەرۆک کۆماری عێراق.

دواتر ڕۆژنامەکە هەر لەم ڕاپۆرتەدا بە ئامانجی ئاشناکردنی خوێنەرانی، بە هەڵوێستی ڕێبەری شۆڕشی کورد لەسەر دانوستانەکانی سەرکردایەتی کورد لەگەڵ حکومەتی عێراق، ئاماژەی بۆ دیدارێکی پەیامنێری ڕۆژنامەکە لەگەڵ بارزانی کرد و بڵاویکردەوە کە مەلا مستەفا بارزانی پێی وایە ئەگەر حکومەتی عێراق دان بە مافە نەتەوەییەکانی کورد نەنێ، جارێکی دیکە شەڕ هەڵدەگیرسێتەوە، بەڵام هەرکاتێ بگەنە ڕێککەوتن، ئامادەیە هێزەکانی هەڵبوەشێنێتەوە و کۆتایی بەشەڕ بهێنێ.( The New York Times, Feb. 16, 1964, p.20). ئەمەش وێناکردنی خواستی ئاشتیخوزانەی سەرکردایەتی کورد بوو، لە شۆڕشەکەی لە پێناو بەدەستهێنانی داوا نەتەوەییەکانی گەلەکەیان هەڵیانگیرساند.

## ئەنجامەکان

دوای لێکۆڵینەوە لە تەوەر و بابەتەکانی ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمزی ئەمریکی لەماوەی توێژینەوەکەماندا لە نێوان ساڵانی (١٩٦١-١٩٦٨)، گەیشتینە ئەم چەند ئەنجامە زانستیانەی خوارەوە:

1-ڕۆژنامەکە سوودی بەبایەخی بە دۆزی کورد لە عێراق گەیاندووە. تەنانەت هۆکارێک بووە بۆ بەنێودەوڵەتیبوونی پرسەکە .

2-بەهۆی مکۆمی هەواڵ و بابەتەکانی لەسەر دۆزی کورد، ڕۆژنامەکە بۆتە نێوەند و سەرچاوەی زانیاری بۆ زۆرێک لە دامەزراوە ڕۆژنامەوانییە جیهانییەکان لە نمونەی ڕۆژنامە پرفرۆشەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا.

3-نزیکبوونەوەی پەیامنێرانی ڕۆژنامەکە لە سەرکردایەتی سیاسی کورد، ڕەنگدانەوەی هەبووە، لەسەر گۆڕینی هەڵوێستی سیاسی نێودەوڵەتی بەرامبەر بە دۆزی کورد لە عێراق.

4-ڕاستکردنەوەی زانیاری دەزگاکانی ڕاگەیاندنی حکومەتی عێراق کە بەچەواشەکاری زۆرەوە بلاودەکرانەوە لەلایەن نیویۆرک تایمز. متمانەی دەزگا ڕۆژنامەوانییە جیهانییەکانی بە سەرچاوەکانی هەواڵی حکومەتی عێراق لاوازکرد.

5-نیشاندانی سیاسەتی توندوتیژی حکومەتی عێراق، بەرامبەر بەگەلی کورد، تا ڕادەیەک هاوسۆزی و پشتیوانی نێودەوڵەتی بۆ دۆزی کورد مسۆگەر کرد.

## پەراوێزەکان

1- ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز، (١٣٢) جار خەڵاتی بولیتزری بەدەستهێناوە، یەکەم خەڵاتی لە ساڵی (١٩١٨) لە سەر پێشکەشکردنی باشترین خزمەتگوازی گشتی وەرگرتووە. خەڵاتەکە لەناوخۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبەخشرێتە باشترین گۆڤار و ڕۆژنامە، کە کاروباری ڕۆژنامەوانی ئەنجام ئەدەن. بڕوانە براوەکانی خەڵاتی بولیتزر لە: https://www.pulitzer.org/winners/new-york-times.

2-ارثر آوکس سولزبرجر جونیور، لە (١٢ی ئەیلولی ١٨٩١) لە شاری نیویۆرک لە خێزانێکی دیاری یەهودی لەدایک بووە. نووسەر و ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکیە. کچی (ادولف اوکس)و موڵکدار و خاوەنی ئیمتیازی ڕۆژنامەی (نیویۆرک تایمز)ی هێناوە. دوای مردنی

ئەوەی دوایی، سولزبرجر دەبێتە خاوەنی ڕۆژنامەکە و کۆمپانیای نیویۆرک تایمز. ناوبراو لە١١ی کانونی یەکەمی ١٩٦٨ کۆچی دوایی کردوە. بڕوانە:.Barbara Winslow Grant, Mother of Times Chairman, Dies at 90, The New York Times, March 9, 2019

3- هنری جارفیس رایموند، ڕۆژنامەنووس و سیاسەتمەدارێکی ئەمریکی بووە. لە (٢٤ی کانونی دووەمی ١٨٢٠) لە نیویۆرک لە ئەمریکا لەدایک بووە. دەرچووی کۆلێژی مافە لە زانکۆی کۆلومبیا. ئەندامی پارتی کۆماری و ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمریکا بووە. دامەزرێنەری کۆمپانیای نیویۆرک تایمزە. لە (١٨ی حوزەیرانی ١٨٦٩) کۆچی دوایی کردوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: Maverick, Augustus, Henry J. Raymond and the New York press, for thirty years : progress of American journalism from 1840 to 1870, Hartford, 1870.

4- ئەم شارە ناسراوە بە پایتەختی کاسۆلیکەکان لە ڕۆژهەڵات یان (شاری کلێسەکان). چونکە (٥٠) کلێسەی لەخۆگرتووە. ئەم شارە بە گەورەترین شاری کریستیانەکان دادەنرێ لە ڕۆژهەڵات و زۆرینەی دانیشتوانەکەی (مارۆنی)نە. شارەکە بە چوارەم گەورەترین شاری لوبنان دادەنرێ لە ڕووی ژمارەی دانیشتوانەکانیەوە کە (١٢٠) هەزار کەسە. بڕوانە: طوني مفرح، موسوعة قرى و مدن لبنان، ج1، دار نوليس، لبنان، 2004.ص9.

5- شاری دير القمر، ناوچەیەکە لە لوبنان و نزیکەی (٤٠) کم لە شاری بەیروت دوورە. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم شارە، بڕوانە:صالح لمحي مصطفى، العمارة الاسلامية في العصر المعني في لبنان- جامع سلطان البر الامير فخرالدين عثمان بن معن في دير القمر، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت، 1985و ص7.

6- هەرچەندە هیچ یەکێک لەسەرچاوە مێژووییەکان ئاماژەیان بە ئەندامانی شاندی کوردی نەکردوە لە کۆنگرەی پاریس ساڵی ١٩١٩، ئەوەندە نەبێ کە زۆربەیان لەسەر ئەوە کۆکن کە (شەریف پاشا) سەرۆکایەتی شاندەکەی کردوە. بەڵام ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لەو هەواڵەیدا، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنی، کە (شێخ عەبدولقادری نەهری) ئەندامێکی شاندی کوردی بووە لە کۆنگەرەکە. سەبارەت بە نوێنەرایەتی کورد لە کۆنگرەی پاریس ساڵی ١٩١٩، بڕوانە: د. كمال مظهر أحمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، مؤسسة أراس للطباعة والنشر، أربيل، 2013، ص335.

7- مەبەستی شێخ عەبدولقادری نەهرییە. ئەو کاتە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران بووە لە دەوڵەتی عوسمانی.

8- دانا ئادامز شمیدت(١٩١٥-١٩٩٤): پەیامنێری ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز بووە بۆ ماوەی سی ساڵ. لە ئەوروپا و باکووری ئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کاریکردوە. هەروەها پەیامنێری ڕۆژنامەی (یونایتد پرێس) و (کریستیان سانیس مونیۆر) بووە. چوار کتێبی بڵاوکردۆتەوە، یەکێک لەمانە لەسەر شۆڕشی کورد بووە، بەناوونیشانی (سەفەرێک بۆ ناو پیاوە ئازاکان). بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: Eric Pace, Dana Adams Schmidt, Reporter Based in Europe and Mideast, The New York Times, August 26, 1994,p.6.

9- سیمور توپینج(١٩٢١-٢٠٢٠): ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکی بووە. ناسراوە بەوەی وەک پەیامنێرێکی بیانی کاریکردوە بۆ گواستنەوەی شەڕەکانی (چین و کوریا و ڤێتنام و لاوس و کمبۆدیا و شەڕی سارد لە ئەوروپا). یەکێک بووە لە دیارترین نووسەرانی ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز. مامۆستا بووە لە زانکۆی کۆلۆمبیا لە سان پاولۆ. بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: ( Robert D. McFadden, Seymour Topping, Former Times Journalist and Eyewitness to History, Dies at 98, The New York Times, Nov. 8, 2020.)

10- سەبارەت بە پرۆژەی (بەرەی یەکێتی نیشتمانی) بڕوانە: زكي جميل حافظ، مذكرات شاهد على ثلاثة عهود من حكم العراق، دار الكتاب الثقافي للطباعة والنشر والتوزيع، الاردن، 2010. ص٢١٩.

11- سەبارەت بە کودەتای (٨ی شوباتی ١٩٦٣)، بڕوانە: بياتي، حامد. أسرار أنقلاب 8 شباط 1963 في العراق في الوثائق السرية البريطانية، مؤسسة الرافد للنشر والتوزيع، لندن،1996، ص107.

## سەرچاوەکان:


- **بەڵگەنامە بڵاونەکراوەکان**

- ئەرشیفی نیشتمانی ئوسترالیا(**National Archives of Australia**).

-Archives:1838,173/2/6/1, Part-2, Iraq- Political- States Kurds, Kurds in Iraq, File No.606/3, Memorandum No.907/65, New York ,4th August 1965.

- **کتێبی بەڵگەنامەیی**

- البياتي، حامد. أسرار أنقلاب 8 شباط 1963 في العراق في الوثائق السرية البريطانية،مؤسسة الرافد للنشر والتوزيع، لندن، 1996.

- **ڕۆژنامە**

- **The New York Daily Times**

A Word about Ouracives, The New York Daily Times, September 18, 1851.

- **The New York Times**

- THE MASSACRE IN SYRIA, July 20, 1860.
- THE INSURGENT KURDS, October 24, 1880.
- THE WORST WAS NOT TOLD, January 14, 1895.
- Turks and Kurds Attack the British, April 15, 1915.
- Kurds Make Peace with Armenians, March 9, 1920.
- IRAQI KURDS' LEADER REPORTED ARRESTED, Sept. 27, 1961.
- 100 Towns Reported Destroyed in Kurds' Revolt Against Kassim, TOWNS DESTROYED IN KURDS' REVOLT Rebels Raid Villages Leader's Party Outlawed, April 24, 1962.
- Kurdish Hide-Out Surrounded, May 11, 1962.
- Dana Adams Schmidt, Kurdish Rebel Chief Says Force Is Only Way to Win --Autonomy; Kurdish Chief Follows Policy of Strength RELIES ON FORCE TO WIN AUTONOMY Mullah Mustafa a Fighter Who Has Often Led His Tribesmen in Revolt Brothers Disagree On Task of Tribe General Relates Story of Republic Kassim Friendly to Kurds at First Rebellion Shows Mark on General, September 11, 1962.
- Dana Adams Schmidt, Kurds' Guerrilla Tradition Aids Rebels in War on Iraqi Army, September 12, 1962.
- Seymour Topping, Iraq Reds Ask Link with Kurds; Have Tacit Approval of Kremlin; IRAQI REDS ASKING LINKS WITH KURDS, Sept. 15, 1962.
- Dana Adams Schmidt, KURDS SAID TO GET OFFERS OF RED AID; Rebel Leader Rejects Bid to Move into North Iran, September 24, 1962.
- Dana Adams Schmidt, Kurd Chiefs Leaving Mountains for Peace Meetings in Baghdad; Kurd Chief's Leaving Mountains for Baghdad Talks Would Ease Pressure Peace Pressures Strong Assurances to Soviet, February 18, 1963.
- Dana Adams Schmidt, KURDS THREATEN TO RESUME FIGHT; Leader Bids Iraqis Grant Autonomy or He Will Declare Independence First Public Threat Kurds Told to Be Ready to Fight; Iraq Is Prodded on Autonomy, March 2, 1963, p.1,2.
- Dana Adams Schmidt, KURDS THREATEN TO RESUME FIGHT; Leader Bids Iraqis Grant Autonomy or He Will Declare Independence First Public Threat Kurds Told to Be Ready to Fight; Iraq Is Prodded on Autonomy, March 2, 1963, p.1,2.
- Dana Adams Schmidt, Kurds and Reds; Barzani Nom Fights Communists, but Autonomy Issue Could Alter Situation U.S. Is Blamed Moves Considered, March 7, 1963.
- Seymour Topping, Moscow Supporting a Kurd State in Iraq; MOSCOW BACKING STATE FOR KURDS Seen as Move for Base Allusion to Arab Plans, May 7, 1963.
- Dana Adams Schmidt, Baghdad Alerts Nation for Drive Against Kurds; Baghdad Reports Big Toll, June 12, 1963.
- KURDS IN BAGHDAD FOR AUTONOMY TALK, Feb. 16, 1964.
- JAMES MORRIS, By Borrowed Mule into Forbidden Territory, June 28, 1964.
- KURDS RENEWING PLEAS TO WORLD, January 24, 1965, p.24.
- DANA ADAMS SCHMIDT, IRAQIS' OFFENSIVE BLUNTED BY KURDS, May 29, 1966.
- THOMAS F. BRADY, IRAQI SAYS KURDS AGREE TO PEACE, June 30, 1966.
- Baghdad Says Kurdish Chief Meets with Iraqi President, October 29, 1966.
- KURDS SEEKING HELP FOR VICTIMS OF WAR, January 31, 1967.
- Eric Pace, Arab Tribesmen Being Shifted from Kurdish District by Iraq, October 3, 1967.
- Eric Pace, Dana Adams Schmidt, Reporter Based in Europe and Mideast, August 26, 1994.
- Eric Dash, Mexican Billionaire Invests in Times Company, Jan. 19, 2009.
- Barbara Winslow Grant, Mother of Times Chairman, Dies at 90, March 9, 2019.
- Robert D. McFadden, Seymour Topping, Former Times Journalist and Eyewitness to History, Dies at 98, Nov. 8, 2020.

- **یاداشت و بیرەوەری**

- حافظ، زكي جميل.(2010)، مذكرات شاهد على ثلاثة عهود من حكم العراق، دار الكتاب الثقافي للطباعة والنشر والتوزيع، الاردن.

- **کتێب-**

**بەزمانی کوردی**

- شمیدت، دانا ئادامز.(٢٠٠٩)، سەفەرێک بۆ ناو پیاوە ئازاکان لە کوردستان، چ٢. و: ئەبوبەکر ساڵح ئیسماعیل. هەولێر: ئاراس

**-بەزمانی عەرەبی**

- ظاهر، جواد. (2010)،ثورة العشرين، ثورة الشعب العراقي الكبرى عام 1920، بغداد.
- أحمد، د. كمال مظهر. (2013)، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، مؤسسة أراس للطباعة والنشر، أربيل.

- مصطفى، صالح لمحي.(1985)، العمارة الاسلامية في العصر المعني في لبنان- جامع سلطان البر الامير فخرالدين عثمان بن معن في دير القمر، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت.

- مفرح، طوني. (2004)، موسوعة قرى و مدن لبنان، ج1، دار نوليس، لبنان.

- ملا، د. جواد.( 2008)، كوردستان و الكورد( وطن مسروق ومغتصب و مقسم، أمة مستعبدة و سجينة و بلا دولة)، ط3، د.م.

- علو، سعيد خديدة،(2007)، العلاقات العراقية الايرانية وأثرها على القضية الكردية في 14 تموز 1958- 8 شباط 1963، دهوك.

- علي، موسى السيد،(2001)، القضية الكردية في العراق من الاستنزاف الى تهديد الجغرافيا، مركز الامارات للدراسات والبحوث.

- **پێگەی ئەلکترۆنی**

-Maverick, Augustus. (1870),Henry J. Raymond and the New York press, for thirty years : progress of American journalism from 1840 to 1870, Hartford, 0. https://pfaffs.web.lehigh.edu/node/58175.

-https://www.pulitzer.org/winners/new-york-times

**أنعكاس القضية الكردية في صحيفة نيويورك تايمز الامريكية**
**في فترة مابين (1961-1968)**

**قارەمان حيدر رحمان**
قسم التاريخ،كلية الاداب،جامعة صلاح الدين،أربيل-أربيل،أقليم كوردستان،العراق
qaraman.rahman@su.edu.krd

**اسماعيل عبدالله اسماعيل**
قسم التاريخ،كلية الاداب،جامعة صلاح الدين-أربيل،أربيل،أقليم كوردستان،العراق
ismael.ismael1@su.edu.krd

**ملخص**
نيويورك تايمز هي صحيفة أمريكية مقرها في مدينة نيويورك. تمتعت الصحيفة بتأثير كبير على قرائها على المستوى الدولي. نُشر العدد الأول في 18 سبتمبر 1851 باسم نيويورك ديلي تايمز. وكانت طوال حياتها واحدة من المؤسسات الصحفية الأكثر ثقة، وفازت بالعشرات من الجوائز الدولية وكانت دائماً واحدة من أكثر الصحف مبيعًا في العالم. ومن المواضيع التي اهتمت بها الصحيفة وخصصت لها مساحة كبيرة خلال الأعوام (1961-1968) هي القضية الكردية في العراق. وعلى هذا الأساس قمنا بهذا البحث العلمي بعنوان (انعكاس القضية الكردية في صحيفة نيويورك تايمز الامريكية في فترة مابين 1961-1968). ويتكون من مقدمة وثلاثة محاور. يتضمن كل موضوع عدة مناقشات. وفي المبحث الأول بعنوان (بداية تعريف الكرد)، سلطنا الضوء بشكل مختصر على بعض هذه المقالات التي تناولت تعريف القومية الكردية بعد تأسيس الصحيفة ونشرها. وفي المبحث الثاني ركزنا على أحداث الثورة الكردية والمطالب القومية. أما الموضوع الثالث والأخير فكان بعنوان (دور الصحيفة في إظهار الموقف السياسي الدولي تجاه القضية الكردية). في هذا الموضوع نسلط الضوء على الموقف الدولي وموقف الصحيفة تجاه القضية الكردية. وأخيرا، توصلنا إلى استنتاج مفاده أن صحيفة نيويورك تايمز قدمت خدمة قيمة للقضية الكردية في العراق. في إطار عمله المهني.

**الكلمات المفتاحية:** كرد، القضية، صحيفة، ثورة، نيويورك.

**Reflection of the Kurdish Issue in the American New York Times**
**During the Period Between (1961-1968)**

**Qaraman Haidar Rahman**
Department of History, College of Art,
Salahaddin University-Erbil, Erbil, Kurdistan Region, Iraq
qaraman.rahman@su.edu.krd

**Ismail Abdullah Ismail**
Department of History, College of Art,
Salahaddin University-Erbil, Erbil,
Kurdistan Region, Iraq
ismael.ismael1@su.edu.krd

**Abstract**
The New York Times is an American newspaper based in New York City. The newspaper has a great influence on its readers internationally. The first issue was published on September 18, 1851 as the New York Daily Times. Throughout its life, it has been one of the most trusted newspaper organizations, winning dozens of international awards and consistently being one of the best-selling newspapers in the world. One of the topics that the newspaper focused on and devoted a lot of space to during the years (1961-1968) was the Kurdish issue in Iraq. On this basis, we conducted this scientific research entitled (Reflection of the Kurdish Issue in the American New York Times newspaper in the period between 1961-1968). It consists of an introduction and three axes. Each topic includes several discussions. In the first section, entitled (The Beginning of Defining the Kurds), we briefly highlighted some of these articles that dealt with the definition of Kurdish nationalism after the founding and publication of the newspaper. In the second section, we focused on the events of the Kurdish revolution and nationalist demands. The third and final topic was entitled (The role of the newspaper in demonstrating the international political position towards the Kurdish issue). In this topic, we highlight the international position and the newspaper's position towards the Kurdish issue. Finally, we came to the conclusion that The New York Times provided a valuable service to the Kurdish cause in Iraq. Within the framework of his professional work.

**Keywords:** Kurd, issue, newspaper, revolution, New York.